زنجیرە کتێبی

# دیاری هاوسەران

بەرگی یەکەم

**پێگە و ئامانجی خێزان و هاوسەرگیری لە ئیسلامدا**

نوسینی

حەسەن عەلی بۆسکێنی

بسم الله الرحمن الرحيم

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ
وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ
وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١

(النساء: ١)

## پێشکەشە بە:

هەردوو هاوسەرە زێدە بەڕێزو ئازیزەکانم

خاتوو: ( ڕابیعەخان، ڕێحان خان)

کە لە هەموو قۆناغەکانی ژیانمدا لێبڕاوانە و دڵسۆزانە

هاوبیرو هاوکارو هاوڕێ و هاوخەمم بوون.

## پێشەکی و ناساندنی ئەم مەوسووعەیە

الحمد لله رب العالمين ،والصلاة على المبعوث رحمة للعالمين، وعلى آله وأزواجه وذرياته وصحبه، والتابعين لهم بإحسان ويقين.

### خوێنەری خۆشەویست!

گومان لەوەدا نییە کە خێزان بەردی بناغەی ژیانی مرۆڤایەتییە بە شێوە هەرە ڕاست و دروست و تەندروستەکەی بەپێی هەموو دینە ئاسمانیەکان و دەستورە زەمینیەکان و جارنامەکانی مافی مرۆڤ و پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان، بەڵام دیارە دەستوورە زەمینیەکان خەریکە وردە وردە لەم ڕاستیە پاشگەزدەبنەوە و دەگەڕێنەوە بۆ دواوە. ئەمەش لە ژێر فشاری کۆمەڵێک لادەرو ڕێزپەڕ لە نەریت و فیترەتی جوانی مرۆڤایەتی، بەڵام ئەمە هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێ کە خێزان جوانترین و گرینگترین شتێکە کە گریمانەی پاراستنی مرۆڤایەتی لە ئەستۆ گرتووە بە جوانترین شێوە.

دیارە لە ناو هەموو دینە ئاسمانیەکاندا بە گشتی وە دینی ئیسلام بە تایبەت گرنگیەکی زۆری بە خێزان داوە، هەر لە پێش دروستبوونی و کاتی دروستبوونی دوای دروستبوونی، هەرەوەها بە وردی باسی لە ئەرکەکان و مافەکان و گرفتەکان و چارەسەرەکان کردووە، خاڵی لەسەر پیت داناوە بۆ هەموو پێداویستییەکانی ئەم بوارە گرنگە. بە دڵنیایی هیچ ژیارو دەستورو دینێک بە قەدەر ئەم ئیسلامە سەرکەوتوو نەبووە لە پاراستنی خێزان و جوان هێشتنەوەی، هەر بۆیە بابەتی خێزان لە ناو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو فەرمودەکانی پێغەمبەری ئازیز و کتێبەکانی فیقهـ و کتێبە تایبەتەکانی ئەم

بوارە زۆرترین پانتایی گرتووە و ڕێو و شوێنی زۆری بۆ دانراوە. سوپاس بۆ خوا کتێبخانەی کوردیش تا ڕادەیەک دەوڵەمەندبووە بەم بابەتە، بەڵام مانای ئەوە نییە، کە پێویست نەکات چیدیکە لەو بارەوە بنوسرێ.

ئەم زنجیرە کتێبەش هەوڵێکە بۆ ئەوەی تاکی کوردی نوسینێکی تائەندازەیەک تێرو تەسەلی لە بەردەستدا بێت دەربارەی خێزان، هەر لە پێش دروستبوونییەوە و وە لەکاتی دروسبوونیەوەو دوای دروستبوونیش، وە باسی پێویستیەکانی خێزان و ئامانج و گرنگی و ئەرک و ماف و گرفتەکان و چارەسەرەکانی و پاراستنی و ئەحکامەکانی بکات.

ئومێدو تەمەننام لە خوای پەروەردگار ئەوەیە کە یارمەتیمان بدات چی باشە و پێویستە و گرنگ و ڕاست و دروستە و جێگا ڕەزامەندی خۆیەتی و جێگای سوود و قازانجە بۆ میلەتەکەمان ئەوە بنوسین.

دڵنیاشین کاری مرۆڤ بێ کەموکوڕی نابێ، هەرچی ڕاست و باش بێ ئەوە هەمووی بەخششی خوایە، ئەوەش کە کەموکوڕی بێ ئەوە لە شەیتان و نەفسی نەزان و سەرکەشی منەوەیە.

ئەم زنجیرە کتێبە بەناو و نیشانی(دیاری هاوسەران) پێکدێ لەم بابەتانەی خوارەوە:

یەک: پێگەو ئامانجی خێزان و هاوسەرگیری لە ئیسلامدا

دوو: لەمپەرەکانی بەردەم هاوسەرگیری و چارەسەرەکانی

سێ : چۆن هاوسەرەکەت هەڵدەبژێری؟ئادەبەکانی هاوسەرگیری

چوار: گرفتەکانی دوای هاوسەرگیری و چارەسەرەکانی

پێنج: مافەکانی هاوسەران

شەش: کۆمەڵێک ئەحکامی شەرعی گرنگی خێزانی

حەوت: پەروەردەی مناڵ

هەشت: ڕەواندنەوەی گومانەکان لەسەر زیاتر لە ٣٠ پرسی گرنگ دەربارەی ئافرەتان

نۆ: پەروەردەی مناڵ

دە: بەختەوەری خێزانی.

بەشەکانی ئەم کتێبەش _ واتە بەرگی یەکەم _ بە پێکدێت لە پێنج بەشی سەرەکی کە ئەمانەن:

**بەشی یەکەم: خێزان چییە؟**

**بەشی دووەم: خێزان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا.**

**بەشی سێیەم: سیما و تایبەتمەندییەکانی خێزان.**

**بەشی چوارەم: وەزیفەی خێزانی مسوڵمان.**

**بەشی پێنجەم: ئامانجەکانی هاوسەرگیری لە ئیسلامدا.**

بە هیوای ئەوەی کە ئەم زنجیرە کتێبە کاریگەری باشی هەبێ لە بەختەوەری خێزانی و کەمکردنەوەی کێشەکانی و ئاشنابوونی هاوسەران بە ماف و ئەرکەکانیان و پەروەردەی مناڵەکانیان و بەرچاوڕونیان لە ئیسلام و ڕەواندنەوەی گومانەکان.

**حەسەن عەلی بۆسکێنی**

**ڕانیە**

## پێناسەی خێزان

### خوێنەری سەنگین!

لەبەرئەوەی خێزان  بەردی بناغەی ژیانی مرۆڤایەتییە، سەرەتا گەرەکمانە بزانین خێزان چیە و بە چی دەوترێ خێزان؟

### خێزان لە ڕووی زمانەوانیەوە:

دیارە پێناسەی جۆراوجۆر هەیە بۆ خێزان، بەڵام دەتوانین بڵێین: ((خێزان بریتییە لە کەسوکاری  کەسێک و نزیکەکانی، کە بە هۆیانەوە بە هێز دەبێت.))

خێزان  لە زمانی عەرەبی پێی دەوترێ (الاسرة) واتە: زرێیەکی بەهێز کە مرۆڤ دەپارێزێت.

- أسر: مانای هێزو توندوتۆڵی دەگەیەنێت، خوای گەورە دەفەرموێ:

نَّحْنُ خَلَقْنَـٰهُمْ وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَآ أَمْثَـٰلَهُمْ تَبْدِيلًا (الإنسان: ٢٨).

واتە: ئێمە ئەوانمان دروست کرد و جومگەکانیانمان قایم پێکەوە بەستووە وە کاتێک بمانەوێت دەیان گۆڕین بە کەسانی تری وەک خۆیان چۆن گۆڕینێک. کەواتە ( أسر) واتە بە هێزی جومگەو لاشەی مرۆڤە.

- دەوترێ: ( أسر الجندی عدوه أی شده بالآسار) سەربازەکە دوژمنەکەی ئەسیر کرد، واتە بە هێزەوە بەستیەوە.

- (أسیر)  ئەو ناوەی لێنراوە لە بەرئەوەی توند کەلەپچە دەکرێ.[1]

---

[1] تلخيص الذهب من لسان العرب / محمد حسين الحسين الجلالی/ بەرگی یەک/ لا ٥٨
المصباح المنير فی غريب الشرح الكبير/ احمد بن محمد  بن علی الفيومی/ لا ٢٣

ئەمانەی کە باسمانکرد زیاتر مانای زمانەوانین بۆ خێزان( الاسرة).

### پێناسەی خێزان لە ڕووی شەرعییەوە:

بەڵام لە ڕووی شەرعیەوە خێزان واتە: ئەو خەڵکانەن کە بە هۆی ژن و مێردەوە کە پایەی بنەڕەتی خێزانن بەیەکەوە دەبەسترێنەوە، وە پابەندن بە ئەرک و مافەکانیانەوە، دواتر وەچەیان لێدەکەوێتەوەو پەیوەندی تری خزمایەتی نزیک و دوور لێیانەوە پەیدا دەبێ.

خێزان بە کۆمەڵێک کەس دەوترێ کە لەیەک نزیکن و هاوپیشەن دەوترێ: أسرة المعلمین، أو أسرة الفنانین، أو أسرة الادباء) ئێمە بە کوردی ناڵێین خێزان چونکە تێکەڵدەبێ لەگەڵ مانای هاوسەر، دەڵێین کۆمەڵی فێرکاران، یان کۆمەڵەی هونەرمەندان، یان کۆمەڵەی وێژەوانان، کە هەر مەبەست ئەوەیە وەک یەک خێزان وان و لە یەک نزیکن و هاوپیشەن[2].

### خێزان لە ڕووی کۆمەڵناسییەوە:

لە فەرهەنگی زانستی کۆمەڵناسیدا هاتووە:

کە خێزان پێکدێ لە کۆمەڵە کەسانێک کە پەیوەستن بەیەکەوە بە هۆی پەیوەندی هاوسەرایەتی و خوێن و منداڵ خستنەوە، وە کار لە یەکدەکەن، ئەم کارلێکردنەش لە نێوان ژن و مێردا پێکدێ و تەواو دەبێ، وە لە نێوان دایک و باوک، وە لە نێوان دایک و باوک و منداڵەکان، وە لە هەموویان یەکەیەکی کۆمەڵایەتی پێکدێ، کە جیادەبنەوە بە کۆمەڵێک تایبەتمەندی، کەواتە بە

---

المعجم الوسیط/ لجنە من العلماء/ ٤٢

[2] القاموس العربی العربی / محمد هادی اللحام ـ محمد سعید ـ زهیر علوان

پێی زانستی کۆمەڵناسی خێزان بریتییە: لە کارلێکردن لە نێوان کۆمەڵێک کەساندا، جا ئەو کەسانە باب و داک بن، یان ژن و مێردبن، یان باب و داک و منداڵەکانیان بن کە بە هۆی خوێن و منداڵ خستنەوە یەکەیەک پێکدێنن.[٣]

**لە ڕووی دەرونزانییەوە:**

بەڵام خێزان لە ڕووی زانستی دەرونزانییەوە ئاوا باسی دەکات: وشەی خێزان ئاماژە دەکا بۆ ژیانی ژن و مێر بە یەکەوە لە سەر بنچینەی پەیوەندی سێکسی کە کۆمەڵگا پەسندی دەکا، وە ئەرک و ماف دەخاتە سەر ئەستۆی هەردوکیان وەک چاوەدێری منداڵەکان و پەروەردەکردنیان، کەواتە بناغەی خێزان بریتییە لە هاوسەرگیری کە تێیدا ژن و مێرد تێیدا دەبنە دوو پایەی سەرەکی بنچینەی خۆشەویستی و میهرەبانی و ئارامی وەک خوای گەورە دەفەرموێ:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا

(النساء: ١)

---

[٣] ١.موسوعة الاسرة ، مراحل تكوين الاسرة تحت رعاية الاسلام / عطية صقر

٢. نظرة في علم الاجتماع المعاصر/عبد الحميد خطيب موسوعة التفسير الموضوعى للقرآن الكريم/مركز تفسير للدراسات القرآنية/ ج ٣

واتە: ئەی خەڵکینە پارێز بکەن لەو خوایەی کە ئێوەی دروستکردوە لە یەک نەفس، هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی دروستکردوە، وە پیاوانی زۆرو ئافرەتانی لەم دوانە بڵاوکردۆتەوە.

١. (مووسا) وتی بە خێزانەکەی ئێوە (لێرەدا) بمێننەوە بەڕاستی من ئاگرێکم بەدی کرد(بینی) بەڵکو هەواڵێکی(ڕێگاتان) بۆ بێنم لای ئەو (ئاگرە) یا جلۆسکێکی ئاگرتان بۆ بینم بەڵکو خۆتانی پێ گەرم کەنەوە.

٢. خێزانی عیمران کە خوای گەورە باسی دەکات کە دواتر دەبێتە دایکی مەریەم و داپیرەی عیسا سەلامی خوایان لێ بێ:

إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّيٓ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ

(آل عمران: ٣٥)

واتە: (بەیاد بێنە) کاتێک هاوسەری عیمران وتی: پەروەردگارا بەڕاستی من بڕیارم داوەو نەزرم کردووە ئەو منداڵەی لە سکمدایە ئازاد کراوبێت لە هەموو ئەرک و ئیش و کارێک(تا هەر لە خزماتی بیت المقدس دا بێت) دە تۆش لێم وەربگرە، چونکە بەڕاستی تۆ خوایەکی بیسەرو زانایت.

٣. زەکەریا داوای مناڵ لە پەروەردگار دەکا سەلامی خوای لێبێ:

هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ (آل عمران: ٣٨)

واتە: ئا لەو کاتەدا پاڕایەوە زەکەریا لە پەروەردگاری وتی: ئەی پەروەردگارم پێم ببەخشە لەلایەنی خۆتەوە کوڕێکی سرووشت پاک بەڕاستی تۆ بیسەری پاڕانەوەیت، وە خوای گەورەش وەڵامی دایەوە.

فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّي فِي ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ (آل عمران: ٣٩)

واته: جا یەکسەر فریشته جبرئیل بانگی کرد لەکاتێکدا زەکەریا له میحرابەکەدا وەستا بوو، نوێژی دەکرد، (وتی) بەڕاستی خوای گەورە مژدەت دەداتێ به بەخشینی کوڕێک ناوی یەحیایه، بەڕاستدانەری فەرمانی تایبەتی خوایه و گەورە و ڕێزدارە و خۆپارێزە له گوناهان و پێغەمبەرێکه له چاکان.

٤. داوودو سولەیمان: سەلامی خوایان لێبێ هەموویان خێزاندار بوون.

٥. پێغەمبەری سەروەرمان علیه الصلاة والسلام که وەفاتی کردوە خاوەنی نۆ خێزان بووه، وه له یەک کاتدا یازدەی هەبووه. وه له دوانیان جیابۆتەوه.

٦. خوای گەورە باسی هەر پێغەمبەرێک دەکا دەفەرموێ: وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَاب

(الرعد: ٣٨) واته: سوێند بەخوا بێگومان پێش تۆ پێغەمبەرانی ترمان ڕەوانه کردووه و هاوسەرو نەوەشمان پێداون، هیچ پێغەمبەرێکیش بۆی نەبووه بەویستی خۆی موعجیزە نیشان بدات ئەگەر ویستی خوای لەسەر نەبووبێت، بۆ هەموو کارو ڕووداوێکیش بڕیارێکی تایبەت هەیه، کەواته پێغەمبەران هەموویان خێزاندار بوون هەتا عیسا که خێزانی نه بووه له دوای دابەزینەوەی له کۆتایی زەمان خێزان پێکدێنێ، وه یەحیا که هاوسەر گیری نەکردوه له بەر

ئەوە بوو کە هێشتا زۆر گەنج بوە کە شەهید بووە، کەواتە بە پێی مێژووی ئاینی بە گشتی و قورئان بەتایبەتی لەوەتەی مرۆڤ هەیە خێزان هەیە.

٧. وە ئەگەر خوای گەورە باسی شەیتانیش دەکا دەفەرموێ وەچەی هەبوە وەک دەفەرموێ:

وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ بِئْسَ لِلظَّـٰلِمِينَ بَدَلًا (الكهف: ٥٠).

واتە: ئێمە کاتێک بە فریشتەکانمان وت سوژدەبەرن بۆ ئادەم، هەر هەموو سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس کە لە دەستەی پەریەکان بوو بەهۆی ئەوەوە لە فەرمانی پەروەردگاری یاخی بوو، ئایا ڕەوایە کە ئەو و نەوەکەی بکەنە پاڵپشت و یارو یاوەری خۆتان لە جیاتی من، لەحاڵێکدا ئەوان دوژمنی هەمیشەیی ئێوەن، ئای کە چەندە کارێکی خراپ و ناڕەوایە بۆ ستەمکاران کە لە جیاتی خوا دوژمنێکی وەک شەیتانیان داناوەو گوێڕایەڵی دەکەن.

**ئازیزانم!**

دیارە خێزان لە بناغەدا لە ژن و پیاو پێکدێ، دواتر بەشەکانی تری لێدەبێتەوە، بە ئاوڕدانەوەیەکی کەم لە مێژووی مرۆڤایەتی و شارستانییەتیەکان و دینەکان دەزانین کە گۆڕانکاری گەورە لە ژیانی مرۆڤەکاندا ڕوویداوە، بە تایبەت ئافرەت کە زیاتر ستەمی لێکراوەوە چەوسێنراوەتەوەو بێ ماف کراوە، هەڵبەتە دەبێ لەوە ئاگادار بین لە دینە ئاسمانیەکاندا پێش ئەوەی کە بشێوێندرێن ئافرەت سەربەرزو ئازاو و ئازاد بووە بە پێی سروشتی کاتی خۆی، لە دیندا ئادەم بێ حەوا نەبوە، ئیبراهیم ڕۆڵە گەورەکەی بە هۆی خێزانیەکانیەوە بینیوە، کە باسی موسی دەکەی دایکی و خوشکی و خێزانی ڕۆڵی گەورەیان بوە، کە باسی عیسا دەکەی یەکسەر دایکیت دێتە بەرچاو، وە خێزانی عیمران دێتە بەرچاو، کە باسی فیرعەون دەکرێ هەرچەندە کە خۆی کافرێکی سەرسەخت بووە، بەڵام نابێ دەوری ئاسیەی خێزانی لە بەرچاو نەگرین لە پاراستنی موساو و پەوەردەکردنی و ئیمان هێنانی لە ماڵی ستەمکارترین کەس، کە فیرعەون بووە، وە کە بێینە سەر ژیانی پێغەمبەری کۆتا درودو سڵاوی خوای لێبێ ئەوە خەدیجەو عائشەو سەودەو ئوم سەلەمەو زەینەب و ... ناکرێ لە بەرچاو نەگیرێ، کەواتە ئەوەی کە باسدەکرێ لە ستەم لە ئافرەت ئەوە لە ژێر سایەیی بێدینی دابووە نەوەک لە ژیانی پێغەمبەران و پیاوچاکان.

## یەکەم :ئافرەت و خێزان لای میسرەیەکان:

لە دیارترین ئەو سیاسەتەی کە لە میسر پەیڕەو کراوە سەبارەت بە سوکایەتیکردن بە ئافرەت ئەوە ئەو چەوسانەوەو سوکایەتیکردنە بووە کە قیبتیەکان لە زەمانی فیرعەوندا کردیان بە ئافرەتانی یەهودی وەک خوای گەورە دەفەرموێ:

وَإِذْ نَجَّيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ (البقرة: ٤٩)

واتە: بیری نیعمەتی ڕزگاربونیشتان بکەنەوە کاتێک ڕزگارمان کردن و لەدەست دارو دەستەی فیرعەون کە خراپترین سزاو ئازاریان دەدان، کوڕەکانتانیان سەردەبڕین و ئافرەتەکانتانیان دەهێشتنەوە (بۆ کارەکەری و خزمەت) ئەوەش بۆ ئێوە توشهات و تاقیکردنەوەیەکی گەورە بوو بۆتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە(تا پشت بەو زاتە ببەستن و بڕوای تەواوتان پێی هەبێت) ئەوەی کە زیاتر ڕێزی لێدەگیرا لە چینی باڵاو دەسەڵاتدارەکان بوون، وە ئافرەتان زۆرترینیان لە دەست دەسەڵاتدارو پاشاو فیرعەونەکاندا بوون بۆ ئەوەی نەوەی زۆر بخەنەوە بۆ پاشاو دەسەڵاتدارەکان نەوەک لە بەر ڕێزی ئافرەت،

### دووەم: ئافرەت لای سۆمەریەکان:

بە پێی سەرچاوە مێژوویەکان ئافرەتی سۆمەری بە کەمێک بە مافەکانی گەیشتوە، توانیویەتی بازرگانی بکا، وە تانیویەتی ماڵی خۆی بە کاربێنێ، وە ئەگەر منالی نەبا دەیتوانی کەنیزەک بۆ مێردەکەی بکرێ و بیکاتە خێزانی، وە ڕێگایان پێدرابو کە پیاو یەک خێزانی هەبێ، ئەوە مەبەست ئەوە نیە کە بۆیان نەبوە چەند خێزانیان هەبێ. مەبەست ئەوەیە چەند ژنیەتی پێویست نەبووە پیاو بیکا، یان نەنگ نەبووە ئەگەر پیاو نەیکا.

### سێیەم: ئافرەت لای بابلیەکان:

ئافرەت لای بابلیەکان وەک کەل و پەلێک وابووە کڕین و فرۆشتنی پێوە کراوە، وە بەڵکو فەوزای جنسیشیان بوە بەدڕەوشتی باوبوە، وە هەتا

په‌رستگاكانیشیان سه‌لامه‌ت نه‌بوه‌ له‌ خراپه‌كاری، وه‌ هه‌تا له‌ یاسای (حه‌مورِابی) رِێگا به‌ پیاودرابو كه‌ بازرگانی به‌ خێزانیه‌وه‌ بكا، له‌ یاسای حه‌موورابیدا هاتوه‌ كه‌ ئه‌گه‌ر كه‌سێک قه‌رزی له‌سه‌ر كه‌ڵه‌كه‌ بوو ده‌توانێ له‌ جیاتی قه‌رزه‌كه‌ی كچه‌كه‌ی و خێزانه‌كه‌ی له‌ جیاتی قه‌رز بدا به‌كه‌سی خاوه‌ن قه‌رز تا به‌ كاریان بێنێ تا قه‌رزه‌كه‌ی ده‌داته‌وه‌، له‌ یاسای حه‌مورابیدا رِێگادرابوو كه‌ له‌ میراتدا جیاوازی به‌ مناڵی خێزانه‌ ئازاده‌كاندا بكرێ له‌ گه‌ڵ مناڵی خێزانه‌ كۆیله‌كاندا.

## چواره‌م: ئافره‌ت و خێزان لای ئاشوریه‌كان

مافی ئافره‌ت لای ئاشوریه‌كان له‌ هی بابلیه‌كان كه‌متر بووه‌، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا بۆی هه‌بوه‌ مامه‌ڵه‌ به‌ ماڵی خۆیه‌وه‌ بكا، به‌ڵام پیاو ده‌یتوانی خێزان و كچی خۆی بدات له‌ جیاتی قه‌رز، وه‌ ئافره‌تانی ئازاد و خانه‌دانه‌كان پابه‌ند ده‌كران به‌ لچک و پۆشاک به‌ڵام ئه‌گه‌ر كه‌نیزه‌ک ئه‌وه‌ی بكردبا ئه‌وه‌ سزا ده‌درا به‌گوێ برِان و به‌رگ لێسه‌نران، به‌رگ و پۆشاكه‌كه‌ی ده‌درا به‌وكه‌سه‌ی كه‌ هه‌واڵی داوه‌ به‌ كۆشک كه‌ فلان كه‌نیزه‌ک له‌چک و پۆشاكی له‌ به‌ركردوه‌، كه‌واته‌ ئاشوریه‌كان زیاتر گرنگیان به‌ ئافره‌تی ئازاد داوه‌ به‌ڵام كه‌نیزه‌ک به‌ هه‌موو شێوه‌یه‌ک سته‌م لێكراوبوو.

## ئافره‌ت لای فارسه‌كان

- یه‌كێک له‌ خراپترین حاڵه‌ته‌كانی ئافره‌ت و خێزانی فارسی بێسه‌رو به‌ری سێكسی بوه‌ كه‌ له‌ هه‌ندێک كاتدا هه‌موو كه‌س وه‌ک یه‌ک له‌ هه‌موو ئافره‌تێک به‌شدار بووه‌، یه‌كێک له‌و پادشایانه‌ی كه‌ ره‌واجی به‌ فه‌وزاو هاوبه‌شی جنسی داوه‌ له‌ رابواردن له‌گه‌ڵ ئافره‌تان پاشا (مه‌زده‌ک) بوه‌.

- یه‌كێک له‌ كاره‌ساته‌كان ماره‌كردنی مه‌حره‌م و نزیكه‌كان بوه‌، هه‌تا ماره‌كردنی كچ و خوشک و نزیكان.

- پاشاكان بێ سنور خێزان و كەنیزەكیان هەبوە .

-یەكێک لە خراپترین حاڵەكانی كۆمەڵگای فارسی چینایەتی بووە، كە ئافرەت هەمیشە لە و توێژانە بووە كە زۆرترتن چەوسانەوەی بەركەوتوە.

- باشترین حاڵەتی ئافرەت كاتی بونی زەردەشت بووە بەڵام دواتر خراپتر لە جارانی لێهاتەوە.

- ئەو باوكانەی زۆرترین كوڕیان دەبوو ئەوە دیاری زۆرو باشیان پێدەدرا.

- ئافرەتانی خانەدان و ناو كۆشک كەمتر بۆیان هەبوو بچنەدەر، وە ئەگەر چوباشن بۆ دەرەوە ئەوە دەبوو زۆر ئاگاداری خۆیان بن و وە ئاگاداریان لێدەكرا.

## ئافرەت لای هیندیەكان

ئافرەت لای هیندیەكان ئێستاشی لەگەڵدابێ حاڵیان باش نییە، بە هۆی یاسابون و شەرعی بوونی چینایەتی. وە لەبەر ئاپۆرایی زۆر، وە لەبەر داگیركران و چەوسانەوە .

- دەبو ئافرەت بە مێردەكەی بڵێ ئەگەر بانگی بكا یان بیدوێنێ، ئەی (گەورەم، ئەی سەیدم)

- ئافرەت خاوەنی ماڵ و سامان نەبوو هەرچی هەیبوو هی هاوسەرەكەی بوو.

- بە شودانی ئافرەتان بە ناچاری و بێ ڕەزامەندی ئەوان ئەنجام دەدرا.

- وە لای هەندێكیان باوبوو كە دەبوو ئافرەت دوای مێردەكەی بسوتێنرێ، یان دەبوو بە زیندوی لەگەڵ هاوسەرەكەی بنێژرێ.

▪ لە شەریعەتی( مانوو) زەواج دروستبوە هەتا لە ڕێ لاقە(إغتصاب) کردنەوە، بەسەردادانی ماڵێک و بە زۆر دەستگرتن بە سەر ئافرەتەکان ڕێگایەک بوە بۆ دروستبون و یاسایی بونی هاوسەرگیری.

▪ چەند ژنی بێسنور ڕەواو ڕێگاپێدراو بوو.

## ئافرەت لای چینیەکان

▪ ئافرەت مافی چونە ناو پەرستگاو و شوێنە پیرۆزەکانی نەبوو

▪ هەتا (کۆنفشیوس )کە وەک پێغەمبەرێک سەیر دەکرێ کە باسی هۆکارەکانی بەدبەختی مرۆڤدەکا، دەڵێ یەکێک لە هۆکارەکانی بەدبەختی ئافرەتە.

▪ لە دایک بونی کچ مایەی شەرمەزاری و هەژاری بوو.

▪ دەبوو ئافرەت گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری ڕەهای هەبێ بۆ هاوسەرو باوک و برا...

▪ یەکێ لە یاسا خراپەکانیان ئەوە بووە کە پیاو و ئافرەت بەیەکیش ڕازی نەبان دەبوو بە هەموو ژیانیان بە یەکەوە بژین.

▪ لە کتابێکدا بە ناوی ( ٥٠ حقیقة ینبغی أن یغیر العالم) دەڵێ ئێستا ژمارەی ئافرەتان لە دەیان ملیۆن لە ژمارەی پیاوان کەمترە لە چین بۆ؟ لەبەر ئەوەی کە چینیەکان بۆیان نییە لە مناڵێک زیاتریان هەبێ لە شارەکان بەڵام لە شوێنە کشتووکاڵیەکان بۆیان هەیە دوو مناڵیان هەبێ، بۆیە ئەوان حەزیان لە کورە، وە ئەگەر کچیان بوو بە جۆرەها شێوە لە ناوی دەبەن، بۆ ئەوەی بگەنە کوڕێک، کەسی وایە زیاتر لە حەوت مناڵی خۆی کوشتوە بۆ ئەوەی بگا بە

کورێک، لە ترسی لە باربردن دەوڵەت سۆنەری قەدەغەکردوە بۆ ئەوەە لە سکی خۆیاندا کچەکە لە بارنەبەن.

- من بەشێک لەو برا بازرگانانەم بینیوە کە بۆ بازرگانی دەچن بۆ چین کە بەراستی ئافرەت ماندو و شەکەتە، جاری وایە ژن و مێرد بە شەش مانگ یەکتر نابینن تەنیا لە ساڵدا مانگێک یان چل ڕۆژیان هەیە بە یەکەوە بژین و بە یەکەوە کۆ ببنەوە.

## ئافرەت لای ڕۆمانیەکان

- هەندێک کات لای ڕۆمانیەکان لە دایکبونی کچ ئەوەندە شەرمەزاری بوە کە بە ڕەوایان داناوە بیکوژن هەر دوای لە دایکبوون.

- باوک دەسەڵاتی ڕەهای بەسەر کچەکەیەوە هەبوە، دەیتوانی بیبەخشێ، بیفرۆشێ، بیکوژێ...

- لە یاسای ڕۆمانیەکان مێ یایەتی هۆکاری ڕەسمی بوە بۆ نە بوونی ئەهلیەتی یاسایی شاهێدی دان و زۆرشتی تر وەک مناڵ و شێت.

- وە ئافرەت مافی میراتی نەبوە.

- لە سەرەتا ڕۆمانیەکان لە سەر ئافرەت زۆر توند بوون لە هاتنە دەرو خۆ دەرخستن، بەڵام دواتر ئەمەیان گۆری بە بەرهەڵدای و تێکەڵی و بەدرەوشتی بیسنور.

- وە هەتا سەدەی حەڤدەمیش موناقەشەی ئەوەیان دەکرد ئایا ئافرەت مرۆڤە؟ ئایا روحی هەیە؟ ئایا بۆ پیاو دروست بووە؟

## ئافرەت لای جولەکەکان

ئێمە ئەگەر بمانەوێ لە ئافرەت تێبگەین دەبێ بگەڕێینەوە بۆ دەقەکانی تەورات بۆ ئەوەی بزانین ئافرەت چیەو خێزان چۆنە، هەڵبەتە دەبێ لەوە ئاگادار بین کە ئەمە دینی شێواوە نەوەک دینی خوای پەروەردگار

١. بە پێی (سفری تەکوین) ئیصحاحی ١٢ ئایەتی ١٤-١٧ ئیبراهیم کە چوە بۆ میسر بە سارای خێزانی وتوە تۆ ئافرەتێکی جوانی مەڵێ من خێزانی ئیبراهیمم چونکە دەمکوژن بە ڵکو بڵێ برامە تا بە هۆی تۆ منیش خێرو بێرێکی زۆرم دەستدەکەوێ، ئەمە دەقە پێمان دەڵێ کە ئیبراهیم بازرگانی بە خێزانیەوە کردوە بۆ ئەوەی خۆی بپارێزی و مادەی دەست کەوێ.

٢. لوت پێغەمبەر لەگەڵ کچەکانی خۆی جوت بوەو منالی خستۆتەوە بە پلانی دوو کچەکانی، ( سفری تکوین/ ئیسحاح ١٩ ئایەتی ٣٣-٣٨، لە کاتێکدا خوای گەورە خەڵکی سەدومی لە ناوبرد لە بەر نێربازی و بەد ڕەوشتی.

٣. روئابین کوری یەعقوب لە گەڵ کەنیزەکی یەعقوبی باوکی خەوتوە لە کاتێکدا ئەم کەنیزەکە لە یەعقوب منالی بوە، بێ ئەوەی خوای گەورە تورەبێ و باوکی گلەیی و گازندەی لێبکا/ سفری تکوین ژمارە ٣٥ ئایەتی ٢١-٢٢

٤. داود پێغەمبەر لەگەڵ خێزانی ئۆریای سەبتی زینای کردوە و ویستیویەتی ئۆریا کە سەرکردەیەکی دڵسۆزی سوپاکەی بوە بە کوشتی بدا، وە بە کوشتیشی دا، دواتر داود خێزانەکەی ئەو سەرکردەی خستە پاڵ خێزانەکانی تریشی و کردی بە خێزانی خۆی، سفری سمۆئیل ی دووەم ، ئیسحاح ی ١١ ئایەتی ٤٢، وە سفری سمۆئیل ی دووەم ،ژمارە ١١، ئایەتی ١٤-١٧

٥. داود بە پێی کتابی پیرۆز ٦٩ نۆ ژنی هەبووە

٦. سولەیمان هەزار ژنی هەبوە ٧٠٠ ی ئازادو ٣٠٠ ی کەنیزەک، سفری ملوکی یەکەم ، ژمارە ١١،ئایەتی ٣

٧. کاتێک ئافرەتانی جولەکە لە حەمام دەرچون لە سەریان پێویستە پیوەندی سێکسی بە دۆستەکانیان لە جولەکەکان بکەن، نەوەک بە هیچ کەسێکی پیس و مەسیحیەک، چونکە ئەگەر وای کرد پێشی وابێ پیرۆز(مقدس) دەمێنێ ئەوە هەڵەیە بە ڵکو دەبێ دووبارە حەمام بکاتەوە. کتاب التلمود،القول الى إلى یوریا ( ٤٨,١٩٨) هاغاه

٨. دیانەتی یەهودی حەڵاڵی کردوە خوێنرێژی، وە هانی داون لەسەر لێدان لە بێتاوانەکان لە پیرو ئافرەت و منالْ، وە بە ڕەوای داناوە داگیرکردنی ماڵێ بێجگە لە جولەکە، وە هەر جولەکە ڕماندنی ئەخلاق و ڕەوشتی بە ئەستۆوە گرتوە لە جیهاند، بەدڕەوشتی خراپەکاری تیرۆر کوشتن جاسوسی درۆ ئەوانە بە رەوشت بەرزی فەزیلەت دەزانی، ئیبراهیم خلیل ئەحمد، کە پێشتر قەشە بوەو دواتر ئەمە قسەی ئەوە

٩. گەلی ئێمە( واتە یەهود ) گەلێکی پارێزگارو برواداره، بەلام پێویستە بەد ڕەوشتی پەرە پێبدەین لە ناو گەلانی بێجگە لە جولەکە، وە دەبێ کوفرو گەندەڵی و خراپە کاری هەموو گەلان دابگری و نابێ پەیوەندی خێزانی و کۆمەڵایەتی بە هێزیان بمێنێ، بۆ ئەوەی بتوانین بەو شێوەیە ڕێنمای و تەوجیە بکەین کە خۆمان دەمانەوێ، حاخام، ریچۆرن

١٠. جولەکە یەکێک لە ئامرازەکان بۆ ڕاوکردنی سەرکردەکان و کەسە ناودارەکانی غەیری جولەکە ئافرەت بەکار دێنێ.

١١. وە ئێستا لە ئیسرائیل مارکێتی ڕانواندنی ئافرەت هەیە. بۆ کرین و فرۆشتن.

کەواتە مادام ڕەوشی ئافرەت و خێزان ئاوابێ لە ناو دەقی کتابە پیرۆزەکانیان کە حاشا ئەم شتانە وتەی خوانییەو ڕەوشتی پێغەمبەران نییە، دەبێ لە واقعی ژیانی ئێستادایان چۆنبێ؟!؛

## ئافرەت لای مەسیحیەکان

سەرەتا بابچینە ناو کتابی پیرۆز بۆ زانینی ڕەوشی  ئافرەت و خێزان، دواتر دەچینە سەر باسی ئافرەتی ڕۆژئاوایی لە ئێستادا.

١. بە پێی سفری تکوین، هۆکاری بەدبەختی و وەدەرنرانی ئادەم لە بەهەشت حەوا بو کە شەیتان لە ڕێی چونە ناو مار خۆی گەیاندێیەو فریوی دا.

٢. هاتوە لە سفری لاوین: في سفر اللاويين ص ١٥ ف ١٩ - ٢٤؛ حيث تقول:

**وإذا كانت امرأة لها سيل، وكان سيلها دمًا في لحمها، فسبعة أيام تكون في طمثها، وكل مَن مَسَّها يكون نجسًا إلى المساء، وكل ما تضطجع عليه في طمثها يكون نجسًا، وكل ما تجلس عليه يكون نجسًا، وكل مَنْ مَسَّ فَرْشَها يَغْسِلُ ثيابَهُ ويستحِمُّ بماءٍ ويكون نجسًا، وإن كان على الفراش أو المتاع الذي هو جالس عليه يكون نجسًا إلى المساء، وإن اضطجع معها رجل وكان طمثها عليها يكون نجسًا سبعة أيام، وكل فراش يضطجع عليه يكون نجسًا".**

بەپێی ئەم دەقە لە کتابی پیرۆزدا ئافرەت کە کەوتە سوڕی مانگانەوە پیس دەبێ، ئەو ڕۆژە تا ئێوارە هەرچی دەستی وێکەوێ پیسی دەکا، هەرچی لە کاتی سوڕی مانگانەدا لەسەری بنوێ پیسدەبێ، هەرچی لەسەری دانیشێ پیسدەبێ، هەرچی دەست بکاتە جێگای ئەو ئافرەتە ئەویش پیس دەبێ و دەبێ خۆی

[4] - المرأة فی اسفار التوراة/ علی عبد الله الجباوی

- الكتاب المقدس الدراسی

- المرأة فی الفكر الاسلامی/ الدكتور جمال  فقی محمد رسول باجلان

بشۆرێ، لەسەر هەرکەل و پەلێک دابنیشێ ئەو شتە پیسدەبێ تا ئێوارە، ئەگەر پیاو لە گەڵی درێژ بێ تا حەوت ڕۆژ پیسدەبێ، ئەو جێگایەش ئەو پیاوە لەسەری دەخەوێ ئەویش پیسدەبێ .

٣. لە پیرۆزترین شوێنی مەسیحیەکان کە فاتیکانە تایبەتە بە پیاوان ئافرەتیان تێدا نییە.

٤. لە مەسیحیەتدا قەشە تا دورتر بێ لە ئافرەت ئەوە خاوێنترەو لە خوا نزیکترە.

٥. بۆت نییە ئافرەت تەلاق بدەی هەرچەندە ژیانیشیان. ناخۆش و نەگونجاو بێ، وە هەر کەس ئافرەتی تەڵاقدراو مارە بکە ئەوە زینای کردوە، ئینجیل متی ،ئیسحاح ١٣، ٦

## ئافرەتانی ڕۆژئاوا لە ئێستادا

-ئافرەتانی تێگەیشتو لە ڕۆژئاوا داوا دەکەن بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە و مناڵ بە خێوکەن لە بری ئیشکردن لە شەقام و کارگەو مارکێت و مەلهاو بارەکان، (بارنز) یەکێک لەبەرێوەبەرە گەورەکانی بیبسی کۆکاکۆلا بڕیاری دا بگەڕێتەوە مناڵەکانی بە خێو بکاو پەروەردەیان بکاو دایکایەتیان بۆ بکا، لە کاتێکدا ساڵانە دوو ملیۆن دۆلار ی وەردەگرت

- موستەفا سوباعی باس لەخۆی دەکا کە ئافرەتێکی ڕۆژئاوای چاوپێکەوتنی لەگەڵ دەکاو لە ژیانی تایبەتی دەپرسێ کە خێزانەکەی لە ماڵەوە ڕۆژانە چیدەکا، دەڵێ بەراستی ئافرەت لای ئێوە شاژنە نەوەک ژیانێکی ئاسایی

- لە هەمانکاتدا بەڕێوەبەری بەناوبانگی پیپسی کۆلا لە بریتانیا هەمان بڕیاری دا بۆ ئەوەی بچێ مناڵەکەی ببێ و دایکایەتی بکا لە تەمەنی ٣٥ ساڵیدا بە ناوی ( Penny. Hugies)

- ئافرەتانی ڕۆژئاوایی باس لە حاڵی ئەو ئافرەتانە دەکەن کە پەروەردەکاری منداڵەکانیانن کاتێک ئەوان دەچن بۆ سەر کار کە توشی چ کارەساتێکی جەرگبڕو دڵتەزێن بوونەوە بە دەست ئەو پەروەردەکارانەوە، ئەمە شتێکی چاوەڕوانکراوە، بە کردەیی سەلمێنراوە کە لە ئافرەتاندا ئێرەیی زیاترە بۆیە بۆی هەیە کە ئافرەتێک هاوسەرێکی باشی هەیەو ئەو نییەتی تۆڵە لەو ئافرەتە بکاتەوە بە هۆی منداڵەکەیەوە، یان ئافرەتێک چەند منداڵێکی هەیە بەڵام ئەو هیچی نییە لەوانەیە ئەو ئافرەتە پەروەردەکارە تۆڵە لەمنداڵەکان بکاتەوەو دڵڕەقی و توندوتیژیان لەگەڵ بەکاربێنێ.

- ئافرەتان لە ئەمریکا خەریکی ئەوەن لە سەعاتەکانی کاریان کەمدەکەنەوە، وە دەستبەرداری پارەکانیان دەبن بۆ ئەوەی زیاتر کات بدەن بە منداڵەکانیان.

- ڕێژەی هاوسەرگیری لە ڕۆژئاوا لە سەدا یەک تێناپەڕێ، بەڵام ڕێژەی جیابونەوە لە هەندێک جێگا بۆ لە سەدا حەفتا بەرزبۆتەوە، بە ئەندازەیەک بەدڕەوشتی پەرەی ساندوە کە ئافرەت نییە بگاتە تەمەنی یاسایی مەگەر توشی سێکس و گێچەڵی سێکسی نەبوبێتەوە، دیارە داتاکان و هاواری ئافرەتان و میدیا شەرم لە وە ناکا کە ڕاستیەکان بە هەموو دونیا بگەیەنن.

- ئێمە دەبێ دان بەوە دابنێین کە لە ڕووی یاسایی مافی باشی ئافرەتان و منداڵان دابین کراوە، بەڵام ئەوە کەلێنی ئەوە پڕناکاتەوە کە ئافرەت ناتوانی هاوسەرگیری بە دڵنیایی بکا، ناتوانی بە ئاسودەی منداڵ بخاتەوە، ناتوانێ بە ئاسودەیماڵدابنێ، ناتوانێ هاوبەشی ژیانی بە دڵنیایی بدۆزێتەوە، ناتوانی خۆی لە گێچەڵی سێکسی ڕزگار بکاو بپارێزێ، ناتوانی ئارامی گیانی بۆ خۆی دەستبخا، ناتوانێ وەڵامە فیکیریەو گرنگەکان دەستبخات، نازانێ بۆ مەسیحیە، نازانێ بۆ مولحیدە، نازانێ بریاری چی بۆ خۆیبدا ئەرێ مێیایەتی باشە یان نێرایەتی یان هیچیان؟! ، ماڵدابنێ یان خەریکی تێرکردنی دامێنی

بێ، نازانێ مناڵ بخاتەوە باشە یان ڕابوێرێ، ئەوە بەدبەختییە کە مرۆڤ نەتوانی وەڵامی ئەو هەموو پرس و پرسیارە گرنگە بداتەوە°

## ئافرەت لای عەرەبەکان پێش ئیسلام:

حاڵی ئافرەت لای عەرەبەکانی ئەگەر لەوانیتر خراپتر نەبوبێ باشتر نەبوە، دەکرێ ئافرەت لە هەندێک شوێن لای هەندێک هۆز ڕێزی لێگیرابێ و کەمێک مافی پێدرابێ بەڵام ئەوە یاسای گشتی و باو نەبوە.

١. بە شێوەیەکی گشتی ئافرەت دەرفەتی گەورایەتی و سەرۆک هۆزایەتی نەبوە مەگەر زۆر بە دەگمەن.

٢. بەلای هەندێک هۆزەوە پەیدابونی کچ شەرمەزاری بوە وەک قورئانی پیرۆز

بۆمان باس دەکا: وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ (النحل: ٥٨)

خۆ ئەگەر مژدەی بوونی کچ بدرێت بە یەکێک لەو نەفامانە، ڕووی گرژو تاڵ دەبێت و ڕەش دادەگیرسێت و سینەی پڕ دەبێت لە خەم و پەژارە:

يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ (النحل: ٥٩)

---

° صور من حياة المرأة فى الغرب، د. مازن مطبقانى

حال المرأة قبل الاسلام وبعده

المرأة في ظل الاسلام د. بدر عبد الحميد هميسة

المرأة بين الشريعة والقانون / مصطفى السباعي

لە داخ و خەفەتی ئەو مژدە ناخۆشە، خۆی دەشارێتەوە لە خەڵکی و بەتەنها (بیر دەکاتەوە): ئایا بیهێڵێتەوە بە زەلیلی و سووکی و بێ نرخی، یاخود زیندە بەچاڵی بکات و بیخاتە توێی خاکەوە، ئاگاداربن؟! ئای کە چەندە خراپە ئەو بڕیارەی کە دەیدەن!! (وەچەو نەوەی خۆیان زیندە بەچاڵ دەکەن).

زۆر جار مولحیدو شۆڤێنیەکان ئەو گومانە پەیدا دەکەن کە کوا؟کێ دەڵێ ئەمە وایە؟ بەلام هەر بەکورتی ئەگەر ئەم هەواڵەی قورئان ڕاست نەبوایە ئەوە ئەو کات زۆر بە زوویی رەتیان دەکردەوەو بە سەر ڕووی پێغەمبەریان دادەدایەوەو دەیانوت ئەوەت لە کوێ هێنا؟

لە شێوازی مارەبرینەکان و دروستکردنی خێزان دەردەکەوێ کە ئافرەت و خێزان چەندە حاڵی خراپ بوە، لای عەرەبەکان چەندین جۆری هاوسەرگیری هەبوە لەوانە:

- النكاح الشرعي : جۆرە مارە بڕینێک وەک ئەوەی ئێستا لەناو مسوڵمانانندا باو بوە کراوە کەم بەم جۆرە مارەبرینە کەس و کاری پێغەمبەرو خۆیشی لەگەڵ خەدیجە هاوسەرگیری کردوە.

- نكاح الاستبضاع: ئەم جۆرە مارەبڕینە بەو شێوەیە بووە ، پیاو بە خێزانەکەی دەوت لە دوای ئەوەی لە سوری مانگانە پاک دەبۆوە، پێی دەوت برۆ بۆلای فلان کەس لەگەڵی جوتبە دواتر هاوسەرەکەی نزیکی نەدەکەوت، هەتا دووگیان دەبوو لەو کەسە، جا دوای دووگیانبون ئەگەر هاوسەرەکەی ویستبای دەچۆوە لەگەڵی دەخەوت، ئەم جۆرە هاوسەرگیریە بۆ ئەوە بووە کە کەسەکە بیویستبا مناڵەکەی نەجیب و ڕەسەنبێ، کە بەراستی ئەو کارە ئەو پەری بێڕێزی بوە هەم بە ئافرەت هەم بە هاوسەرەکەی، هەم بە مناڵەکانی.

- نكاح الرهط: ئەم جۆرە مارەبرینە بەو شێوەیە بووە، کە کۆمەڵێک پیاو کە ژمارەیان لە ١٠ کەس کەمتر بووە، دەچون بۆلای ئافرەتێک دوای ئەوەی کە

دووگیان دەبوو بانگی ئەو کەسانەی دەکرد کە لەگەڵیان خەوتبوو دەیوت ئێوە ئاگاتان لە حاڵەکەیە ئەو منالە لە یەکێکتانە، ئافرەتەکە بە دڵی خۆی بە یەکێکیانی دەوت فلان کەس ئەوە منالی تۆیە دەی ناوی بنێ، دواتر بەناوی ئەو پیاوە ناودەنرا.

- نکاح الرایات أو البغایا: ئافرەتان ئالایان هەڵدەدا بۆ بەدرەوشتی، لەگەڵ چەندین کەسدا ڕایان دەبوارد لە دوای ئەوەی کە منالیان پەیدابوو بانگی ئەو کەسانەیان دەکرد کە لەگەڵیاندا جوتبووبوون، دواتر سەرناسێکیان دەهێناو دەیان وت بزانە ئەو منالە بە کێدەچێ، دوای ئەوەی سەرناسەکە( قائف) بیدابایە پاڵ کێ دەبوو بە منالی ئەو.

- نکاح الشغار: گۆڕینەوەی ژن بەژن: بەیەکتریاندەوت تا تۆ خوشکەکەی یان کچەکەی خۆتم نەدەیتێ منیش خوشکی خۆم یان کچی خۆم نادەم بە تۆ ، بە بێ مارەیی بەیەکیان دەگۆڕیەوە و دەبون بە مارەیی یەکتر بە بێ ئەوەی ئافرەتەکان ئازادیان هەبێ لەم هاوسەرگیرییە.

- نکاح المتعة: مارەبرین بۆ لەزەت و ڕابووردن، ئەم مارە برینە بۆ کاتی و بە پارە بووە، هەرکات ماوەکەی تەواو بوو لە یەکجیادەبنەوە ڕاستەو و خۆ.

- نکاح الخدن والصداقة: مارەبرینی بە دزی، ئەمەش جۆرێکی تری مارەبڕین بووە،کە عەرەبەکان دەیانگووت : ما استتر فلا بأس به، و ما ظهر فهو لوم، واتە ئەوەی بە دزی دەکرێ ئاساییە مەبەستیان پەیوەندی ناشەرعی بوو، بەڵام ئەوەی بە ئاشکرایە جێگای گلەییە.

- نکاح المقت: مارەبرینی خێزانی باوک.

- نکاح البدل: مارەبرینی ژن گۆڕینەوە.

- نكاح الاغتصاب: مارەكردنی بە تۆبزی و زۆرە ملێ( لاقە كردن).[٦]

[٦] الانكحة الفاسدة انواع الزواج قبل وبعد الاسلام / ناصر عبد الرزاق
الانكحة الفاسدة / دراسة فقهية مقارنة/ عبد الرحمن بن عبد الرحمن الاهدل
الانكحة الفاسدة المنهية في الشريعة الإسلامية/أمير عبد العزيز

## بەرایی

### خوێنەری خۆشەویست!

ئەم بەشە لە دوو  بڕگەدا باس دەکەین:

**بڕگەی یەکەم: سیما و تایبەتمەندییەکانی خێزان بەگشتی**

**بڕگەی دووەم: سیما و تایبەتمەندییەکانی خێزانی مسوڵمان.**

ئێستاش با بچینە  سەر بڕگەی یەکەم:

**بڕگەی یەکەم: سیما و تایبەتمەندییەکانی خێزان بەگشتی**

- خێزان دیاردەیەکی گەردونییە: بۆیە دەبینین کۆمەڵەی خۆر، جیهانی ئاژەڵان، باڵندەکان ڕووەکەکان، کەڕوەکان، فایرۆزەکان هەموو ئەوانە شێوازی خێزانی پێکدەهێنن.

- خێزان دیاردەیەکی جیهانییە: لەوەتەی مرۆڤ هەیە خێزان هەیە، ئەمە لە هەموو دینەکان و ژیارەکان و کۆمەڵگاکاندا هەبووە، وە مێژو و شوێنەوارەکان پشتڕاستی ئەم ڕاستییە دەکەنەوە.

- خێزان کۆمەڵگایەکی ژمارە سنورداره، وە  بچوکترین پێکهاتەی یەکەی کۆمەڵگایە.

-لە ناو خێزاندا چەندین پەیوەندی دینی، کۆمەڵایەتی، ئابوری، ئیداری ، دەرونی هەیە، وە هەموو ئەوانە زیاتر مرۆڤ  بە خێزانەوە گرێ دەدەن.

- خێزان ئەو ناوەندەیە کە غەریزەو فیترەتی مرۆڤ دەیخوازێ، بۆ مانەوەو بەردەوام بونی جۆری ئینسانی، وە تێیدا مرۆڤ غەریزەی دایکایەتی باوکایەتی

خۆشەویستی سۆزداری هاوکاری دێنێتەدی، بۆیه خێزان دیاردەیەکی پێویست و حەتمییه بۆ بەردەوامبونی ژیانی مرۆڤ، هەرکەس دژایەتی خێزان بکا، ئەوە دژایەتی غەریزەو فیترەت و پێکهاتەی بنچینەیی مرۆڤی کردووەو بە ئاراستەی شەپۆل و زریان دا دەڕوا لە هەموو ژیانیدا کە ئەمەش کاری مرۆڤی ژیر نییه.

- خێزان لە ناو هەرگەلێکدا پەیوەندی توندی هەیە بە بیرو باوەڕو نەریتی ئەم گەلە، ئەمە ریشەی قوڵی هەیە لە ژیانی هەموو گەلاندا، وە هەتا ئێستاش کە زۆر هەوڵ هەیە بۆ سڕینەوەی خێزان و پەیوەندی خێزانی زۆر هەستی پێدەکرێ، ئەوروپاییەکان شانازی بە مەسیحیەتەوە دەکەن، جولەکەکان بە جولەکایەتی بوداییەکان بە بوداو ، هیندۆسەکان بە دینەکانی خۆیان و مسوڵمانان بە ئیسلامەوە.

- خێزان ئەو بازنە گشتیەیە کە چوارچێوەی ڕەوشت و پەیوەندی تاکەکان دیاری دەکا، ئەگەر خێزان تەبعێکی دینی هەبێ ئەوە دیندارانە ڕەفتار دەکەن، وە ئەگەر وەڵاتێکی یاسای بێ ئەوە خەڵکەکە یاساییانە مامەڵە دەکەن، وە ئەو ڕەوشتانەی کە لە حەزارەتێکدا هەن ئەوە دەگوازرێتەوە وەچە لە دوای وەچە، واتە خێزان سەرچاوەی نەریت و پەیوەندیەکان و ئادابەکانە، وە لە هەمووشیان گرنگتر دینە.

- خێزان سیستەمێکی کراوەیە بەسەر بوارەکانی تردا، ئەگەر خێزانەکان خراپ بوون ئەوە ئەو خراپە دەکرێتەوە بەسەر بواری ڕامیاری، ئابوری،کۆمەڵایەتی، دەرونی ... وە بە پێچەوانەش هەر ڕاستە، ئەگەر سیستەمی بەڕێوەبردن خراپ بوو ئەوە خراپەکانی دەسەڵات دەگوازێتەوە بۆ ناو کۆمەڵگا، کەواتە کۆمەڵگا بە خێزان و سیستەمەوە بە یەکەوە کارلێکراو و کار لێک کەرن.

▪ ئەوانەی کە باسمان کردن بە گشتی تایبەتمەندی هەموو خێزانەکان بوون، بەڵام زیاد لە وانە خێزانی مسوڵمان چەندین تایبەتمەندی و سیمای دی جیاوازی هەیە، لە بڕگەی دووەمدا باسی دەکەین:

## بڕگەی دووەم: سیما و تایبەتمەندییەکانی خێزانی مسوڵمان:

### یەکەم: الربانیة: خودایی بوون:

مەبەستمان لە رەبانی بوونی خێزان ئەوەیە کە سەرچاوەی بوون و بەڕێوەچونی لە دینی پەروەردگار وەردەگرێ و بە پێی دینی پەوەردگارە، چونکە دیارە مسوڵمان دینێکی هەیە کە هەموو ژیانی ڕێکدەخاو ڕێنمایی دەکا بۆ بەختەوەری دین و دونیا، بەڵگەمان لەسەر ئەمە چەندین ئایەتی پەروەردگارە کە دەفەرموێ:

- إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ ( آل عمران: ١٩) واتە: بەڕاستی دینی پەسەند کراو لای خوا ئیسلامەو بەس.

▪ خوای گەورە دەفەرموێ: وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ (آل عمران: ٨٥) واتە: هەر کەسێ بەدەر لە ئیسلام، هەر دینێکی دیکەی هەبێ، قبووڵ نییە و لە دوارۆژا لە ڕیزەی زیانبارانە.

▪ وە دەفەرموێ:

أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ (المائدة: ٥٠)

واتە: ئایا ئەوانە سیستەم و حوکمی نەفامی دەخوازن؟! جا کێ حوکمی لە خوا جوانترە بۆ گەلێک کە لە ڕاستی دینی خوا دڵنیابن.

- مادام خاوەنی بوونەوەرو مرۆڤ خوای پەروەردگار بێ، هەر ئەو مافی ئەوەی هەیە کە نەخشەو پلان و بەرنامە بۆ مرۆڤ دابنێ.

- مادام خوای پەروەردگار لە هەموو کەسێ زاناترە هەر ئەو مافی ئەوەی هەیە نەخشەو بەرنامە بۆ مرۆڤ و تەواوی دروستکراوەکان دابنێ.

- مادام خوای گەورە مرۆڤی دروستکردوە هەر ئەویش دەزانێ چی بۆ مرۆڤ باشە، چونکە مرۆڤ بونەوەرێکی بێ ڕێنمای و پلان نییە.

- مادام مرۆڤ هەستەکان و تواناکانی سنوردارن ناتوانێ بەرنامەی تێرو تەسەل بۆ خۆی دابنێ.

- مادام مرۆڤ حەزو ئارەزوی هەیە ناتوانی بە یەکجاری خۆی لە چوارچێوەی حەزو ئارەزوەکانی ڕزگار کا.

- مادام مرۆڤ ترس و تەماعی هەیە ناتوانی خۆی لێیان ڕزگارکا.

- مادام خوای گەورە مرۆڤاکانی وێڵ نەکردەوەو لێیان نەگەڕاوە بە هۆی ئەوەی پەیتا پەیتا شەریعەت و پەیامبەرانی بۆ ناردوون، مرۆڤ دەبێ پابەندی ئەو شەریعەتانەو گوێڕایەڵی ئەم نێردراوانە بێ.

- مادام مرۆڤ تەنیا بۆ دونیا دروست نەبووە، بەڵکو ڕێگاکەی لەوە درێژترەو بە دونیادا گوزەردەکا بۆ ژیانێکی ئاوەدانترو درێژتر دەبێ پابەندی دینی خوابێ.

## دووەم: العالمیة: جیهانی بوونی خێزانی مسوڵمان

مەبەستمان ئەوەیە خێزانی مسوڵمان بەرنامەیەکی جیهانی هەیە، ئەمە بە بەڵگەی نەقلی و ئەقڵی

- خوای گەورە دەفەرموێ:

تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا (الفرقان: ١)

واتە: پاک و گەورەی و فەرو پیرۆزی بۆ ئەو خوایەی کە فورقانی ناردوە بۆسەر بەندەکەی کە (موحەمەدە) بۆ ئەوەی بۆ جیهانیان ببێتە وریا کەرەوەو بە ئاگاهێنەوە

- وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ (الأنبياء: ١٠٧).

واتە: ئەی محمد صلی الله علیه وسلم) ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو جیهانەکان (جیهانی ئادەمیزاد و گیاندار و ڕووەک و پەری و... هتد)

- وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ (سبأ: ٢٨)

واتە: وە ئێمە تۆمان نەناردووە مەگەر بۆ هەموو ئادەمی بە مژدەدەرو ترسێنەر بەڵام زۆربەی ئادەمی نازانن.

- بە بەڵگەی ژیری و تەجروبە دەرکەوتوە کە ڕەسولی خوا درودو سەلامی لێبێ زیرەکترین و دڵسۆزترین و بەهێزترین و میهرەبانترین و لێزانترین و لێبڕاوترین مرۆڤە بۆ هەموو جیهانیان، کەواتە ئەوە وامان لێدەکا کە خێزان لە سەر ڕێنمای ئەو زاتە دابمەزرێنین.

- ئەم سەروەرە بە کردەیی خاوەنی خێزان بوەو لە ئێش و ئازارو گرنگی خێزان تێدەگا، ئەو وەک عیساو یەحیا نەبوە کە خێزانی نەبوبێ، ئێمە ناتوانین لە ڕووی خێزانیەوە لەکەسێکەوە فێربین کە خێزاندار نەبوبێ.

- وە پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام سەرکەوتوترین مرۆڤ بووە لە ڕووی خێزانداریەوە.

- خێزانەکانی لە هۆزو نەتەوەو ئاینی جۆراو جۆر بوون، بۆ نمونە خێزانی هەبوە کە پێشتر جولەک بووە وەک(سەفییە) کە لە جولەکەکانی خەیبەر بوو، وە (مارییە) کە میسری بوو قیبتی بوو، خێزانی هەبوو پێشتر منالّی هەبوو یان شوی تری کردبو کە ئەمە زۆربەی خێزانەکانی وا بوون

- پێغەمبەری خوا ژیانی هەتیوی، هەژاری، دەولّەمەندی، دەربەدەری، بێدەسەلاتی، دەسەلاتداری، ئاشتی شەرو جەنگ، سولّح و نێوەندگیری، هەموو دەورەکانی لە ژیانیدا بینیبوو، بۆیە گونجاوترین کەسە بۆ ئەوەی لێیەوە فێری خێزانداری بین.

## سێیەم :الشمولیة: واتە هەمەلایەنی:

خێزانی مسولّمان یەکێک لە تایبەتمەندیەکانی هەمە لایەنی و گشتگیرییە، خێزان پێکهاتەیەکی هەمەلایەن و پەیوەندیدارە بە هەموو لایەنەکانی ژیانەوە، بواری سیاسی تێدا، بواری ئابوری، کۆمەلّایەتی، پەروەردەیی،زانستی، پێداویستی خێزان جۆراو جۆرە، پەیوەندیەکان هەمەجۆرن لە خێزاندا باوک، دایک، منالّ، نەوە، باپیرو داپیر، خوشک و برا، خزمی دورو نزیک هەیە، وە هەروەها پێداویستیەکانیش جۆراو جۆرن ، بۆیە دەبیّ کەسێک لێیەوە فێری خێزانداری ببین کە ئەوانەی هەبن و لێیان تێبگا، وە شەریعەتی پەروەردگار خالّی لەسەر پیت داناوە سەبارەت بە هەموو پێداویستیەکانی خێزان، لە پێش دروستبونیەوە، لە کاتی دروستبون، لە ناو پرۆسەکەدا، لە دوای دروستبون و هەتا دوای مردنیش حەق و مافەکان هەر دەمێنن. پەیوەندیەکان بەس مادی نین، لە هەمان کاتدا ڕوحیشن.

## چوارەم: الانسانية: ئینسانی بوون:

مەبەست لەوەی کە تایبەتمەندی خێزان ئینسانییە ئەوەیە کە نابێ ئەوە لەبەرچاو نەگرین کە خێزان پێکهاتوە لە تاکەکان، هەموو ئەو تاکانەش مرۆڤن، مرۆڤیش بونەورێکی تایبەتەو پێکهاتەیەکی تایبەتی هەیە.

- مرۆڤ خاوەنی ژیرییە دەبێ وەڵامە ژیریەکانی بدرێتەوە لە ناو خێزان و دەرەوەی خێزان.

- مرۆڤ خاوەنی دەرونێکی دوو سەرەیە لە حەزی چاکەو خراپە دەبێ لە خێزاندا کۆنترۆڵ بکرێ، یان بە یارمەتی لە دەرەوەی خێزان.

- مرۆڤ ئارەزوی جنسی هەیە.

- مرۆڤ ئارەزوی ناو ناوبانگی هەیە.

- مرۆڤ حەزی دەوڵەمەندبوونی هەیە.

- مرۆڤ حەزی ناوبانگی هەیە.

- مرۆڤ حەزی بەرگری لە خۆکردنی هەیە.

- مرۆڤ حەزی خواردن و خواردنەوەی هەیە.

- مرۆڤ حەزی لە جوانی و پۆشتەو پەرداخییە.

- خەزی لە زانین ئاگادابوونی شتەکان و شتی فزوڵییە.

- حەزی لە مانەوەیە.
- حەزی لەسەرکەوتنە.
- حەزی لە دەسەڵات و سامانە.
- حەزی لە پێشەنگ و پێشەوای سەرکەوتو و جێگای شانازییە.
- لە ناخدا حەزی لە بەندایەتییە.
- حەزی لە وەچەو نەوەیە.
- ترسی لە مردن هەیە.
- ترسی لە نەیارەکانی هەیە.
- ترسی لە نەگەیشتن بە ئامانجەکانی هەیە.

کەواتە مرۆڤ بونەوەرێکی  تایبەتە دەبێ دینێک هەبێ وەڵامگۆی هەموو پرسیارو پرس و ترسەکان و هیواکانی بێ، کە بە واقعی هیچ دین و سیستەمێک نییە ئەوەندەی ئیسلام بتوانی ئەم داخوازیانە بێنێتە دی.

## پێنجەم: الواقعية واتە: واقعی و ڕیالی بوون:

مەبەستمان لە واقعی بونی خێزانی مسوڵمان ئەوەیە کە نابێ ئەو دین و بەرنامەیەی کە دەیەوێ ژیانی خێزان ڕێکبخا واقع و پێکهاتەی ژن و پیاو لە یاد بکا، ئافرەت تایبەتمەندی خۆی هەیە، پیاویش تایبەتمەندی خۆی هەیە، وە لە هەردوکیشیاندا خاڵی هاوبەش هەیە، پیاو نابێتە ئافرەت، وە ئافرەتیش نابێتە پیاو، قەت پیاو نابێتە خاوەنی رەحم، یان مەمک، یان نەرم و ناسکی، یان خوێنی سوری مانگانە، یان دووگیان بوون، وە ئافرەتیش نابێتە پیاو نە لە

ڕووی دەرونیەوە، نە لە ڕووی جەستەییەوە، داخوازیەکانی ئافرەت جیاوازە، وە داخوازیەکانی پیاویش جیاوازە، پیاو لە دەنگی، لە رەنگی، لە پێکهاتەی تەواوی لاشەی، لە ئومنیات و داخوازیەکانی جیاوازە، ئەگەر بێت و لە ڕوی زانستی و دەرونی باسی جیاوازی پیاو و ئافرەت بکرێ بە کتابێکی قەبارە گەورە تەواو نابێ، وە زۆریش شتی لەسەر نوسراوە.

سروشتی مرۆڤ ئەوەیە کە حەزو خولیاو ئارەزوی هەیە، هەڵە دەکا، تەوبە دەکا، کاریگەرە بە چاکە بە خراپە، بە دەورو بەر، لە سروشتی مرۆڤدا سەرکەشی هەیە، دەبێ تەمبێ کردن و سزا هەبێ، ڕاستە کۆمەڵێک خاڵی هاوبەش لە تەواوی مرۆڤەکاندا هەیە بەڵام ژینگەو نەریت و دین و شارستانیەت جیاوازی لە مرۆڤەکاندا دروستدەکا، بۆیە بەرنامەی خوا بۆ ڕێکخستنی خێزان گونجاوترینە، هەر بۆیە تاکی ئەوروپی، یان ئەفریقی، یان ئاسیایی یان هەر ژینگەیەکی تر دەتوانێ ئیسلام جێبەجێبکاو بە پێی دەقە دینیەکان خێزان پێکبێنێ و زۆریش بەختەوەربێ.

## شەشەم: الجزائية: واتە: هەبوونی پاداشت و تۆڵە:

لە سروشتی مرۆڤەکاندا سەرکەشی هەیە، هەموو کەسێک بە حوکمی فیترەت یان ژیری یان ئامۆژگاری دینی پابەند نابێ، بۆیە دەبێ بۆ ئەو جۆرە کەسانە سنورو تەمبێ کردن هەبێ بۆ ئەوەی زیان بە خۆیان و دەورو بەر نەگەیەنن، وە بۆ ئەوەی ژیان و ژینگە تێکنەدەن وەک ئێستا کە دەبینین بە داخەوە، وڵاتە زلهێزەکان بە کەیفی خۆیان ژەهرو دوکەڵ و گاز بە سروشتدا بڵاو دەکەنەوەو کەسیش ناتوانێ پابەندیان کا، بە کەیف و حەزی خۆیان جەنگ هەڵدایسێنن و ئاگرو ئاسن و فسفۆرو گۆگردو ... بەسەر سەری مرۆڤایەتیدا هەڵدەڕێژن، هیچ کەسێک ناتوانێ سزایان دا.

وە نابێ تەنیا بیر لە سزا بکەینەوە بەڵکو دەبێ بیر لە پاداشتیش بکەینەوە، هەربۆیە بنچینەی تۆڵەو سزا لە دوا ڕۆژە کە مرۆڤ بە پاداشت و سزای دادپەروەرانەی خۆیدەگا، لە دونیا زۆر کەس بە ئاسانی لە ژێردەستی یاسا قوتاریان دەبێ بەڵام لە دوارۆژدا دەرفەتێک بۆ ئەوە نییە، زۆر کەس هەیە هەزاران کەسی کوشتووە یان ستەمی لێکردوون، ئایا چۆن دەکرێ تۆڵەی ئەم هەموو ستەمە لە کەسێک بکەینەوە لە دونیا؟ یان کەسێک چاکە لەگەڵ سەدان و هەزاران کەسدا دەکا ئایا چۆن دەکرێ لەم دونیا کورتەدا پاداشتی بدەینەوە؟ بێگومان ناتوانین.

**لە ئیسلامدا سێ ئاستی ئەخلاق و پابەندیمان هەیە:**

**یەکەم:** پابەندی بە یاساکانەوە کە دانراوون، ئەوە کەمترین ئاستی ئەخلاقییە ، چونکە شکاندنی هەر یاسایەک پێشێلکردنی مافی گشتییە یان تایبەتییە، خوای گەورە لە چەندین ئایەتدا دەفەرموێ:

تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ (البقرة: ٢٢٩)

واتە: ئەمانە سنورو یاساکانی خوای گەورەن مەیانشکێن ، هەرکەس یاساکانی خوا بشکێنێ هەر ئەوانن ستەمکا

وە دەفەرموێ:

...تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ..... (البقرة: ١٨٧)

واتە: ئەوانەی کە باسکران سنورو یاساکانی خوای گەورەن توخنیان مەکەون بە شکاندن و تێپەڕاندن

دووەم: چیت بۆخۆت پێخۆشە ئەوەشت بۆ خەڵک پێخۆشبێ، وە پێغەمبەری ئازیزمان فەرمویەتی علیه الصلاة والسلام: " ( لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ. ).[7]

واتە ئیمانتان تەواو نابێ تاچیتان بۆ خۆتان پێخۆشە ئەوەشتان بۆ براو خوشکەکانتان پێخۆش نەبێ

سێیەم: ئاستی بەسەر خۆدا هەڵبژاردن( الإيثار) کە ئەمە بەرزترین ئاستی ڕەوشت بەرزییە، وەک خوای پەروەردگار لە مەدحی ئەنسارەکاندا دەفەرموێ:

وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ (الحشر: ٩)

واتە: وە بۆ ئەو هەژارانەی کە لەپێش کۆچکەراندا نیشتەجێ بوون لە مەدینە و کردیان بە بارەگای باوەڕ، ئەوی کۆچ بکات بۆ لایان خۆشیان دەوێ وە شک نابەن لە دڵی خۆیاندا هیچ جۆرە حەسوودی و بەخیلیەک لەبەر ئەوەی بە کۆچکەران درا، وە باوی ئەوان ئەدەن بەسەر خۆیاندا با خۆشیان زۆر پێویست بن پێ ی وە ئەو کەسەی خۆی لە ڕژدی دەروونی بپارێزێت (بەڕاستی) هەر ئەوانن سەر فرازان.

**بەهێزترین پابەندکارەکانی ئەخلاق و ڕەوشت بەرزی ئەمان.ەن:**

- دین، کە لەهەموویان بە هێزترو کاریگەرترە

[7] رواه مسلم، ٤٥ ، رواه البخاری١٣

- یاسا
- نەریت
- ویژدان
- هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی

وە ئەگەر ئەمانە هەمووی یان زۆربەی لە مرۆڤێکدا کۆبێتەوە بێگومان کەسەکە زۆر جوان پابەندو بە ڕەوشتدەکا، وە هەموو ئەوانەش لە چوارچێوەی دینی ئیسلامدا جێگای دەبێتەوە بە دڵنیایی، چونکە ئیسلام دژی یاسای چاک و نەریتی جوان و ویژدانی زیندو نییە، بەڵکو پاڵپشیاندەکات و خەڵکیان بۆ هاندەدات

## حەوتەم: المثالية واتە: نمونەیی

مەبەستمان لە نمونەیی خەیاڵی نییە بەڵکو ئەوە بەشێکە لە پابەندی ئەخلاقی بەڵام لە ئاستە هەرە بەرزو جوانەکەی، بۆیە یەکێک لە تایبەتمەندی خێزانی مسوڵمان پابەند بوونە بە چاکە تا ئەندازەی شۆک کردن و سەرسامکردن، وە ئێمە زۆرمان لە ژیانی پیاو چاکان و زانایان ،خوێندۆتەوە کە بە ئەندازەیەک پابەندی یاسا شەرعیەکان بوون لە ئاستی تاک و خێزانیدا کە جێگای سەرسوڕمانی ئێمە بوون، بە کورتی مرۆڤ، وە خێزانی مسوڵمان هەتا بیەوێ بە پەیژەی ڕەوشتجوانیدا باڵا بڕوا دەرفەتی لە بەردەستدایەو سنوری بۆ نییە

## هەشتەم: التعاون: هاوکاری یەکترکردن

ئەمەش تایبەتمەندی خێزانی مسوڵمانە کە دەبێ هاوکارو تەواوکاری یەکتر بن، جا ئەو هاوکارییە:

- لە نێوان ژن و مێردا بێ.
- یان لە نێوان دایک و باوک و منداڵەکاندا بێ.
- یان لە نێوان بابەگەورەو دایە گەورەو نەوەکاندا بێ.
- یان لە نێوان خوشک و براکاندابێ.
- یان لە نێوان تەواوی خزماندا بێ.
- یان لە نێوان جیران و هاوسەرفەرو هاوپیشەکاندا بێ.
- هەتا لە نێوان هەموو مرۆڤایەتیدا بێ.
- هەتا هاوکاری ئاژەڵانیش بێ.
- هەتا هاوکاری ژیان و ژینگە بێ.

خوای گەورە ئەمەی ناوناوە هاوکاری ( التعاون) وەک خوای گەورە دەفەرموێ:

...وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ

(المائدة: ٢)

واتە ئێوە هاوکاری یەکتر بن لە سەر چاکەکردن لە لە گەڵ یەکداو ترسان لە خوا، هاوکار مەبن لە سەر سەرپێچی خواو دەستدرێژی بۆ سەرمافی خەڵک، وە لە خوا پارێزبکەن و بترسن، چونکە بەراستی خوای گەورە تۆڵەو سزای توندە.

وە پێغەمبەری ئازیز علیه الصلاة والسلام دەربارەی هاوکاریکردنی یەکتر فەرمودەی زۆرن لەوانە:

**- ( مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا ؛ نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ. وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ ؛ يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ. وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا ؛ سَتَرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ. وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ.)** رواه مسلم، ٢٦٩٩

واتە: هەرکەسێک ناخۆشیەک لە ناخۆشیەکانی دونیا لەسەر بڕوادارێک لابا، ئەوە خوای گەورە ناخۆشیەک لە ناخۆشیەکانی دوارۆژی لەسەر لادەبا، هەرکەس کاری مسوڵمانێک ئاسان بکا، جا قەرزی لەسەر لابا، یان بیبەخشێ لە بەشێکی ئەوە خوای گەورە ئاسانکاری بۆ دەکا لە دونیاو و دوارۆژدا، وە هەرکەسێک ناتەواوی و عەیب و عاری مسوڵمانێک داپۆشێ  ئەوە خوای گەورە لە دونیاو دوارۆژ عەیبەکانی دادەپۆشێ، وە هەرکەس هاوکاری براوخوشکەکانی بێ لە هەر کارێکی خێر ئەوە خوای گەورەش لە یارمەتی ئەودا دەبێت.

لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێ کە ئەویش تەواوکاری ئەو فەرمودەیە بە دیوێکی دیکەدا: **( أَخُو الْمُسْلِمِ، لَا يَظْلِمُهُ، وَلَا يُسْلِمُهُ ، وَمَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ، كَانَ اللَّهُ فِي حَاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرُبَاتِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ.)** رواه البخاري، ٢٤٤٢

واتە: مسوڵمان برای مسوڵمانە، ستەمی لێناکا، تەسلیمی دوژمنی ناکا هەرکەس لە یارمەتی براکەیدابێ ئەوە خوای گەورەش لە یارمەتی ئەودا هەرکەسێک ناخۆشیەک لەسەر مسوڵمانێک لابدا ئەوە خوای گەورە ناخۆشیەکانی دوارۆژی لەسەر لادەدا،هەرکەسێک عەیب و ناتەواوی مسوڵمانێک داپۆشێ ئەوە خوای گەورە عەیب و ناتەواویەکانی دادەپۆشێ لە دوارۆژدا.

## نۆیەم: المحبة: یەکترخۆشویستن

لە تایبەتمەندی خێزانی مسوڵمان یەکتر خۆشویستنە لە نێوان ئەندامەکانیدا، خوای گەورە لە نێوان هەموو مسوڵماناندا خۆشویستنی پەسندو پێویست کردوە جا چ جای لە نێوان ئەندامانی خێزانێکدا، خوای گەورە کە مەدحی یارمەتیدەرەکان( الانصار) دەکا دەفەرموێ: یحبون من هاجر إليهم، ئەوانە یان خۆشدەوێن کە کۆچیان بۆ لاکردن، وە پێغەمبەری خوا دەفەرموێ عليه الصلاة والسلام: ( لَا تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَوَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ ؟ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ)[٨]

پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: ناچنە بەهەشتەوە هەتا ئیمان نەهێنن ، وە ئیمانی کامڵتان نابێ تایەکتریتان خۆشنەوێ، ئایا شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر ئەنجامتاندا یەکترتان خۆشبوێ؟ جا کەواتە لە نێوان خۆتاندا سەلام بڵاو بکەنەوە

ئیبن قەییم لە کتێبی ( روضة المحبين) دا دەڵێ: هەموو گەردون بە هۆی خۆشەویستیەوە بەڕێوە دەچێ، ئەم قسەیە زۆر ڕاستە، چونکە لە جوانترین واتاکانی خۆشەویستی بە یەکەوە گونجانە، هەموو گەردونیش کارەکەی تەواوکارییە، مرۆڤ ئەگەر کەسێکی خۆشویست خۆی لە گەڵدەگونجێن.

## دەیەم: مراعاة الحقوق: واتە ڕەچاوکردن و پاراستنی مافەکانی یەکتر

خێزان کە لە کۆمەڵێک ئەندام پێکدێ، لە سەروی هەرەمی خێزانەوە ژن و مێرد هەیە، دەبێ هەموو ئەندامانی خێزان ڕەچاوی مافەکانی یەکتر بکەن،

---

[٨] رواه مسلم ٥٤

خوای گەورە لە ئایەتێکدا باسی نۆ لەو کەسانە دەکا کە دەبێ مافیان پارێزراو بێ دوای خوای پەروەردگار، وەک دەفەرموێ:

یەکەم ماف: مافی پەروەردگارە جلا جلالە:

وَٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا

دووەم : باوک و دایک :

وبالوالد◉ن إِحْسَٰنًا

سێیەم: خزمان:

وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ

چوارەم بێباوکان:

وآتوا ال◉ت◉م◉

پێنجەم: هەژاران:

والمس◉◉ن

شەشەم: جیرانی نزیک لە ماڵ و دین و خزمایەتی:

وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ

حەوتەم: جیرانی دوور لە ماڵ و دین و خزمایەتی:

وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ

هەشتەم: هاوڕێی سەفەر یان خێزان، یان هاوپیشە:

وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنبِ

نۆیەم: ڕێبوارو ئاوارە:

وابن ٱلسَّبِيلِ

دەیەم: ژێردەستەکان لە کۆیلەو کەنیزەک و خزمەتکارو کرێکارو ...

وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا (النساء: ٣٦)

کەواتە خێزان دەبێ ڕەچاوی مافەکانی یەکتر بکەن، دەنا ژیانیان ئەوە نابێ کە خوای گەورە لە خێزانێکی مسوڵمانی داواکردوە.

## یازدەیەم: التكافل : کەفالەی یەکترکردن لە ڕووی مادییەوە

دیارە خێزانی مسوڵمان بە حوکمی ئەندام بونیان لە ناو یەک خێزاندا ئەرکی مادی و مەعنەویان دەکەوێتە سەر یەک، بۆیە لە ناو خێزاندا یاسای نەفەقە کێشان هەیە.

- نەفەقەی ژن لە سەر پیاو واجبە بە پێی توانا.

- مارەیی واجبە لەسەر هاوسەرەکەی.

- نەفەقەی منداڵەکان واجبە لەسەر باوکیان لەو کاتەی کە پێنەگەیشتوون، وە لەدوای پێگەیشتنیان ئەگەر پێویستیان بەیارمەتی دان هەبوو، وە ئەگەر باوکیشیان توانای هەبوو

نەفەقەی دایک و باوک لەسەر منداڵەکانیان واجبە ئەگەر ئەوان موحتاج بوون و منداڵەکانیش هەبووبن.

- وە نەفەقەی خزمان بە پێی توانا.
- وە نەفەقەی ئەوانەی کە ئەرکیان دەکەوێتە سەر خاوەن ماڵ.
- وە نەفەقەی ئەو ئاژەڵ و باڵندانەش کە لە ماڵەوە بە خێو دەکرێن.
- وە نەفەقەی خزمان و جیران و ... بە پێی نزیکی و پێویستی.
- وە دەبێ دەوڵەت ئەرکی بەخێوکردنی هاوڵاتیان بە ئەستۆوە بگرێ بە پێی توانا.
- وە ئەوانەش کە هەتیون یان هەژارن دەبێ کۆمەڵگاو دەوڵەت بە خێویان بکەن.

کەواتە کۆمەڵگا بە گشتی، وە خێزان بە تایبەتی دەبێ کەفالەی یەکتر بکەن

## دوازدەیەم: العبودیة: بەندایەتی

خێزانی مسوڵمان خێزانی بەندایەتیە بۆ پەروەردگار، شیعارەکانی دین دەبێ لە ماڵی مسوڵمان جێبەجێ بکرێ لە نوێژ، ڕۆژو، قورئان خوێندن، زیکر، دوعا، قوربانیکردن، هاوکاری لە سەر خێرو چاکە، گوێگرتن لە ئامۆژگاری باش و بەسود، سەرقاڵبوون بە پێی پێویست بە کەناڵ و سایتی باش.

## سێزدەهەم: الثقة المتبادلة بین أفراد العائلة: متمانە بە یەکتربوون لە ناو خێزاندا

سیمای خێزانی مسوڵمان ئەوەیە کە متمانەیان بە یەک هەبێ و نەهێنی یەکتر بپارێزن، ئەو متمانە لە ناو هەموو کۆمەڵگادا دەبێ هەبێ بەڵام لە ناو خێزاندا زیاتر، دەبێ هاوسەران، دایکان و باوکان نمونەی ئەو متمانە بە یەکبوون و

نەهێنی پاراستنە بن بە شێوەی هەرە جوانەکەی، ئەوان مامۆستاو و پێشەنگن لە ماڵەوە مناڵەکان چاو لەوان دەکەن و لاسای ئەوان دەکەنەوە، بۆیە دەبێ هاوسەران زۆر وریابن لە هەڵس و کەوتەکانیان. رەوشتی متمانە بە یەکترکردن زۆر گرنگە چونکە هاوسەران گیان و ماڵ و ناموسیان بە یەکتر سپاردوە

## چواردەهەم: الطمأنينة والسكينة: واتە ئارامی و ئۆخژنی

یەکێک لە ئامانجەکانی خێزان و خێزانداری بریتی یە لە ئارامی و ئۆخژنی، خوای گەورە دەفەرموێ:

وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (الروم: ٢١)

واتە: لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خوای گەورە بۆ ئێوە ئەوەیە: کە لە خۆتان هاوسەرانی بۆ دروستکردون ، بۆ ئەوەی بە هۆی ئەوان ئارامیتان بۆ بێ ، وە گێڕاویەتی لە نێوانتاندا خۆشەویستی و میهرەبانی، لەوانەدا کە باسکران چەندین بەڵگەو نیشانە هەیە بۆ گەلێک کە بیردەکەنەوە.

## پازدەهەم: الاحترام المتبادل: رِێز لە یەکترگرتن

خێزانی مسوڵمان دەبێ ڕێز لە یەکتربگرن، وە ئەوە بکەنە نەریت، بۆ ئەوەی مناڵەکان چاو لە دایک و باوکیان بکەن، وە بچوکەکان چاو لە گەورەکان بکەن، دیارە ئەوە مانای ئەوە نییە کە خێزان هەمیشە جیدی بێ و پێکەنین و خەندەی تێدا نەبێ، بەڵام ئەوەی خۆشەویستی دەیکا ناتوانێ توندو تیژی بیکا.

## شازدەهەم: البیت الریاضی:ماڵێکی وەرزشی

دەبێ یەکێک لە سیمای ماڵی مسوڵمان گرنگی دان بە وەرزش و تەندروستی بێ، بە داخەوە زۆر لە گەنجان ژیانیان بۆتە بەشێک لە وەرزش، لە جیاتی ئەوەی وەرزش بەشێک بێ لە ژیانیان، مسوڵمان دەبێ بە هێزبێ لە پێشبرکێدا براوەبێ، وە دەبێ متمانەی بە خۆی بێ و چالاک بێ، جا وەرزشی لاشە بێ یاخود وەرزشی ژیری و بیرکردنەوەو زانیاری وەرگرتن بێ.

## حەڤدەهەم: العائلة الفرحة: خێزانێکی دڵخۆش

سیمای خێزانی مسوڵمان ئەوەیە کە کەیف خۆش و دڵخۆش بن، دەبێ بە خەندەوە بدوێن و پێشوازی لە یەکتر بکەن.

هیچی تێدا نییە کە جارجار گوێ لە سرودو گۆرانی و مۆسیقای سودبەخش بگرن، دەرونی مرۆڤ پێویستی بە ئیسراحەتە، پێویستی بە دەنگی خۆشە، پێویستیان بە مەنزەرەی جوانە، پێویستیان بە گەشت و گەڕانە، پێویستە چەندین ئامرازی وەرزش و خۆشگوزەرانی هەبێ لەماڵەوە ئەگەرنا سەردانی ئەو شوێنانە بکەن کە تایبەتە بە وەرزش و بەسەربردنی کات بە دڵخۆشی

## هەژدەهەم: العائلة الاقتصادية: خێزانێکی ئابوریزان و ئابووریکار

لەوانەیە بەلای هەندێک کەسەوە ئەم بابەتەو چەند بابەتی تریش زیادبن، بەڵام لەمڕۆدا خێزان لە هەرکات زیاتر پێویستی بە ئابوری و ئابوری زانییە بۆ ئەوەی خێزان سەربەخۆی و ئازادی خۆی بپارێزێ، ئەوە مانای ئەوە نییە کە هەموو ئەندامانی ماڵ دەتوانن کار بکەن، بەڵام گرنگە خێزان بیر لەوە بکاتەوە کە کارێک بکەن لە ماڵەوە بە گشتی ئەنجام بدرێ، یان ئافرەت بەرگدروی لە ماڵەوە یان هەرکارێکی دەستی بکا ئەگەر نەشتوانێ لە دەرەوە کار بکا، بۆ ئەوەی بتوانن ئەرکی سەرشانی یەکتر سوک بکەن، بە داخەوە بەشێک لە پیاوان لە بەرامبەر نەفەقە کێشانی ماڵ و مناڵیان منەت دەکەن کە ئەمە هەم گوناهە هەم وا لە ماڵ و مناڵ دەکا تام لە ژیان نەکەن، وە هەست بە منەت باری دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێ خێرو چاکەکانتان بە تاڵ مەکەنەوە بە هۆی منەت و ئازاردنی بەرامبەرەوە:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَـٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفۡوَانٍ عَلَيۡهِ تُرَابٞ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٞ فَتَرَكَهُۥ صَلۡدٗاۖ لَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّمَّا كَسَبُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ (البقرة: ٢٦٤)

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، نەکەن خێرو پاداشتی چاکەکانتان پووچ بکەنەوە بە منەت نان و دڵ ئازاردانی (هەژاران)، وەکو ئەو کەسەی ماڵ و سامانی خۆی لەبەر چاوی خەڵکی ببەخشێت بۆ ڕیاکاریی و خۆنواندن و ئیمان و باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی نەبێت، جا نموونەی ئەو جۆرە کەسانە وەک بەردێکی ساف وایە کە خۆڵێکی بە سەرەوە بێت، لەووەدوا بارانێکی لێزمە بباریت بەسەریداو هیچی بەسەرەوە نەهێڵێت و بەرەق و تەقی بەجێی بهێڵێت و حەقیقەتی دەربکەوێت، (ئینجا ئەو جۆرە ڕیابازو بێ باوەڕ منەتنەرانە) هیچ جۆرە بەهرەیەک لەو بەخشینەیان بەدەست ناهێنن، بێگومان خوای گەورە ڕێنموویی قەومی بێ باوەڕو کافران ناکات.[٩]

---

[٩] بۆ ئەو بابەتانە سود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:
اصول الدعوه/ عبد الکریم زیدان
مکتبه الاسرة المسلمه/ خالد عبد الرحمن العک
المدخل لدراسة الشريعة الاسلامية/ الدکتور مصطفى الزلمی

خۆشەویستانم!

خێزان لە ناوکۆمەڵگای ئیسلامی کۆمەڵێک ئەرک و وەزیفەی هەیە لەو ئەرک و وەزیفە گرنگانە:

یەکەم: الوظيفة البيولوجية: وەزیفەی (بایالۆجی) لە نێوان ژن و مێردا بریتییە لە خستنەوەی وەچە بە شێوەی تەندروست و شەرعیانە، دیارە ئەمەش ئاداب و ڕێکاری شەرعی و تەندروستی و کۆمەڵایەتی خۆی هەیە، کە دواتر باسی ئادابەکانی خێزان دەکەین، لە ناویشیدا باسی جوتبوون و شەوی گواستنەوەو گرنگییەکەی، کە چەندین ڕێنمای گرنگی تێدایە، کە پێویستە ڕەچاو بکرێت.

دووەم: الوظيفة الدينية والاخلاقيه: خێزانی مسوڵمان هەر لە پێش دروستبوونییەوە بە ئامانجی دیندارانە ژیانی هاوسەری پێکدێنێ، وە دەشیەهەوێ لەسەر دین ژیان ڕایی بکا و هەر بە پێی دین ڕزق و ڕۆزی پەیدابکاو منالّەکان بە خێو بکا، دەیەوێ بەو نییەتەوە ڕەفتاربکات لەگەڵ یەکتردا بکەن، هەروەها دەیانەوێ منالّەکانیان بە ڕەوشتی جوان و پەسند پەروەردە بکەن، بۆیە وەزیفە و ئەرکی خێزان قورسە لە بواری دین و ڕەوشت بەرزییەوە.

سێیەم: الوظيفة الاجتماعية: ئەرکی کۆمەڵایەتی خێزانی مسوڵمان، خێزان مادام لە ناو کۆمەڵگادا بژی دەبێ بزانێ چۆن ڕەفتار لەگەڵ دەورو بەردا دەکا، پێکهاتەکانی کۆمەڵگا جیاوازە، وە پێکهاتەی کۆمەڵگا چەندین بازنەی بچوک و گەورەی هەیە، وە چەندین جیاوازی هەیە لە کۆمەڵگادا، جیاوازی ئایینی، زمان، ڕەنگ، مەزهەب، ڕەفتار، بۆیە گرنگە ئەندامانی خێزان وریاییان هەبێ دەربارەی پێکهاتەکانی کۆمەڵگاو چۆنیەتی ڕەفتارکردن لە گەڵیاندا.

چوارەم: الوظيفه التربوية: ئەركی پەروەردەكردن دیارە پەروەردە جۆراو جۆرەو ئەركێكی هەمە جۆرەیە، لەمڕۆدا بە هۆی زۆربونی كۆمەڵگاو پێداویستییەكانی و جیاوازیەكانی ئەركەكانی پەروەردە سەختبووە، دەبێ ئاگامان لە پەروەردەی ئایینی، ژیری، ئابوری، دەرونی كۆمەڵایەتی، تەندروستی، جنسی، وەرزشی ...

پێنجەم: الوظيفة الاقتصادية: وەزیفەی ئابوری دیارە خێزان پێداویستی مادی هەیە، دەبێ هەوڵ بدرێ ئەندامانی خێزان پێویستیە مادەكانیان بۆ دابین بكرێ، نابێ چاویان لە دەرەوە بێ و لە ڕێگای ناشەرعی و نا یاسایی پێداویستیەكانیان دابین كەن، نابێ لە تەمەنی نە گونجاو دەست بۆ كار بەرن، دەبێ بزانن مناڵ چەند پارەی پێدەدرێ و كەی پێی نادرێ، وە چۆن دەبێ پاداشتی مادی بكرێن یان مەعنەوی، ئەوە مانای ئەوە نییە كە بەس منال پێویستی بە دیاری و دەست خۆشیە، بەڵكو هاوسەران بۆ یەكتر، باوكان و دایكان بۆ مناڵەكان، بە پێچەوانەوە، خوشكان و برایان...

دیارە دەبێت دەوڵەت پلانی ئەوەی هەبێ چۆن كار بۆ خەڵك دابین بكات لە كەرتی گشتی و تایبەتی، وە دەكرێ مناڵەكان بە پێی تەمەنیان فێری گرنگی ئابوری و بنەماكانی ئابوری بكرێن.

شەشەم: الوظيفة العقلية: ئەرك و وەزیفەی ژیری مناڵ قۆناغەكانی ژیانی هەستیارن، هەر قۆناغەو پێداویستی و پرسیاری خۆی هەیە، وێڕای بوارە زانستیەكان كە لەخوێندنگا فێری دەبێ پێویستە مناڵ و ئەندامانی خێزان ژیرانە پەروەردە بكرێن، وە پرسیاری ژیرانەیان ئاراستە بكرێ و ژیریان تاقی بكرێتەوە.

**حەوتەم: الوظيفة النفسيه:** ئەرک و وەزیفەی دەرونی منداڵ پێویستی بەوەیە دەرونێکی تەندروست و ئارامی هەبێ، وە دەبێ متمانەی بە خۆی هەبێ، وە دەبێ بە پێی قۆناغەکان هەوڵی لەگەڵدا بدرێ پشت بەخۆی ببەستێ بۆ کارەکانی لە ماڵەوە، لە قوتابخانە، لە ژورەکەی، وەڵامی پرسیارەکانی بدرێتەوە بۆ ئەوەی لێی نەبێتە گرێی دەرونی، دەبێ بزانی بە کێ کاریگەرە، کێی خۆشدەوێ، حەزی لە چییە؟ چ بەهرەیەکی تێدایە؟

**هەشتەم: الوظيفة التعاونية:** ئەرک و وەزیفەی هاوکاریکردنی یەکتر: ئەمەش یەکێکە لە ئەرکەکانی خێزان کە دەبێ لەناو یەکدا تەباو ئارام و بەخشندەو لێبوردە بن، وە خۆشەویستیان بۆ یەکتر هەبێ. وە ئەم روحیەتی هاوکارییە بگوازنەوە بۆ دەرەوەی خێزان

**نۆیەم: میدیایی: الاعلامية:** ئەرک و وەزیفەی میدیایی سەیرنییە کە باس لەو جۆرە ئەرکەی خێزان بکرێ چونکە میدیا بۆتە بەشێک لەژیانی ئەمرۆ لە دەرەوەو لە ناو ماڵەکاندا، بۆیە هەر کەس بتوانی بەسەر منداڵەکانی ڕابگاو بتوانی کۆنترۆڵی کات و ساتەکانی سەیرکردنی مۆبایل و ئایپادەکەی بکات دەتوانێ لە بوارەکانی تریش سەرکەوتووبێت.

ئازیزانم! دیارە زۆر بواری تریش هەیە دەکرێ خێزان پێی هەڵبستێ، دیارە ئەرکی خێزان لە پێش دروستبوونیەوە دەست پێدەکات و لەگەڵ مرۆڤدا دەمێنێتەوە تا لە ژیاندا بمێنێ، وە لە دوای مردنیش ئەرکییەتی کە پەروەردەو ڕێنمای جوان و مادەی پێویست بۆ منداڵەکانی بە جێ بێڵێ و بیکاتە وەسییەت.

## بەرایی

**خوێنەری بەڕێز!**

بە پێی تێڕوانینی ئیسلام هیچ شتێک لەم گەردوونەدا بێ ئامانج نییە لە گەورەترین بەشەوە تابچووکترین. هەموو شتێک ئامانجدارە و لە پێناوی ئامانجێکدا بە دیهێنراوە. ئامانجە هەرە گەورەکە بەندایەتی و ملکەچییە بۆ پەروەردگار، لە پاشان ئەو ئەرکە تایبەتەی کە خوای گەورە بەو شتەی سپاردووە، جا بۆ وەدیهێنانی ئەم ئامانجانە، ئەرکەکان بەش بەش بوون، بە تایبەت بۆ ئێمەی مرۆڤ، ئێمە بە چەندین لایەنەوە دەتوانین ئەرکەکەمان ئەنجامدەین:

لایەنی بیرو باوەڕ: الجانب العقدی.

لایەنی پەرستشەکان: الجانب العبادی.

لایەنی ڕەوشت: الجانب الاخلاقی.

لایەنی مامەڵە بە هە موو بوارەکانەوە: الجانب التعاملی بکافة جوانبه.

لە بواری مامەڵەدا یەکێک لە و بوارانەی زۆر گرنگی پێدراوە بواری باری کەسێتییە (الاحوال الشخصیة) کە لە هاوسەرگیرییەوە دەستپێدەکا و بەردی بناغەی خێزان بە شێوەی تەندروست دادەمەزرێ، بەڵام گرنگە ئێمە لە ڕوانگەو دیدگای شەریعەتەوە لە ئامانج و نەهێنی و فەلسەفەو حیکمەتەکانی زەواج بە پوختی تێبگەین، چونکە هەر شتێک لە ئامانج و حیکمەتەکەی تێگەیشتی خۆشی بە دڵ دەداو ئاسان جێبەجێدەکرێ، بۆیە لەم باسەدا بە پوختی باسی ئامانج و حیکمەتەکانی زەواج دەکەم لە گرنترینی ئەو ئامانج و حیکمەتانە

## یەكەم: جێبەجێكردنی فەرمانی خوای گەورە: الامتثال لأمرالله

خوای گەورە دروستكارو بەدیهێنەری ئێمەو هەموو جیهانیانە بێگومان هەر ئەو دەزانێ چی بۆ ئێمە باشە، بۆ دین و دونیا، بۆ دونیاو دوارِۆژ وەك دەفەرموێ: أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ (الملك: ١٤)

واتە: مەگەر خوا نازانێت كێی دروست كردووەو چۆنی دروست كردووە، لەكاتێكدا ئەو زاتە وردكارو بە سۆزو ئاگایە.

هەر ئەو پەروەردگارەی كە ئێمەی بە دیهێناوە ئەركی خستۆتە سەر شانی ئێمە، ئێمەش بە هەردوو رِەگەزەوە دەتوانین ئەو ئەرك و بەندایەتیە جێبەجێ بكەین، بۆیە بەرپرسیاریەتیەكە دوو قۆڵییە تەنیا بە یەك رِەگەز وەدی نایا، ئەم دوو رەگەزەش كە مادام كاریان بە یەكەوەو تەواوكاریە دەبێ جۆری پەیوەندی و ژیانیان دیاری بكرێ ، ئەویش بناغەكەی هاوسەرگیرییە، هەر بۆیە پەروەردگار هاوسەرگیری بۆ مرۆڤ داناوەو پەیوەندیەكانی دیاری كردوە، وە فەرمانی بەو هاوسەر گیرییە كردوە وەك دەفەرموێ:

وَأَنكِحُواْ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ (النور: ٣٢)

واتە: ژن بدەن بە پیاوانی بێ ژن و ئافرەتانی بێوەژن بدەن بەشوو، هەروەها ژن بدەن بە بەندە صالحەكانتان و كەنیزەكە كانیشتان بدەن بە شوو ئەگەر هەژاریش بن، ئەوە خوا لە فەزڵ و بەخششی خۆی بەهرەوەریان دەكات، خوای گەورەش هەمیشە فراوانگیرو زانایە.

وشەی (أیم) ژن و كچ دەگرێتەوە، وە كورو پیاو دەگرێتەوە، مەبەستم ئەوە نییە كە كورِ پیاو نییە بە مانای كەسایەتی ،یان كچ ژن نییە، مەبەستم

جیاکردنەوەی ئەو دووحاڵەتەیە لە یەکتر، وە مەبەست لە (عبادو إماء ) کۆیلەو کەنیزەکە ئەویش دیسان بەهەردوو جۆرەکەیەوە، کەواتە:

.- ئەرکی کۆمەڵگایە هاوکاربێ کە هیچ کام لەم دوو ڕەگەزە بێ هاوسەر نەهێڵێتەوە.

-دەوڵەت دەبێ هاوکار بێ بۆ ئەم پرۆسەیە بە دابین کردنی دامەزراندن و پێدانی پێشینەو دانی قەرزی بچوک و دابینکردنی شوێنی نیشتەجێبون بە پێی توانا

- دەست ڕۆیشتوو و خوا پێداوەکان دەبێ هاوکار بن بە گەخشندەیی و ماڵ و زەکاتەکانیان.

-دەبێ باوک و دایکان و کەس و کار هاوکاربن بە ئاسانکاری بۆ کردن لە وەلامدانەوەو داخوازی شەرعی کچ و کورەکان

- وەزارەتە پەیوەندی دارەکان هاوکاربن، بە تایبەت وەزارەتی پلاندانان، کۆمەلایەتی، پەروەردەو فێرکردن

- میدیا هاوکار بێ کە کاریگەری زۆری هەیە، لە ڕێی بەرنامەی تایبەت و بانگکردنی کەسانی پسپۆرو نیشاندانی لایەنە جوان و ئەرێنیەکانی هاوسەرگیری، وە لێکەوتە خراپەکانی دورە پەرێزی لە هاوسەرگیری

-ڕۆشنبیران و مامۆستایانی ئایینی و کۆمەڵناسان و... هەموو هاوکاربن.

- خودی کوڕو کچەکانیش هاوکاربن بۆ پرۆسەکە بە تێگەیشتن لە گرنگی پرۆسەکە و هەوڵ بۆدانی و نەگەڕان بە دوای جێگرەوی ناشەرعیدا.

-جولانەوەی ژنان دەبێ کاری بۆ بکەن و هاوکاربن ، بە داخەوە دەیان سەدان ڕێکخراوی ئافرەتان هەیە، من نەمبیستوە یەکێکیان کاربکا بۆ ئاسانکاری هاوسەرگیری

- جوڵانەوە فیمینیستەکان لەجیاتی برەو دان بە هاو رەگەزبازی و برەودان بە بەدڕەوشتی و یاخی کردنی ژن لە پیاو، با ژن فێری ئەوە بکەن چۆن فێری هونەری ژیان بن، فێریان کەن ئەگەر مێردەکانیان نەخۆش بون، یان تووڕەبون، یان هەژار بوون، یان ئەگەر قوتابی بوون، یان ئەگەر ئەرکیان قورس بوو، یان ئەگەر دوورە وڵات بوون چۆن لە گەڵیان بژین.

خوای گەورە دەربارەی پرۆسەی هاوسەرگیری لە ئایەتەکەی دوای ئەو ئایەتە دەفەرموێ: وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَـٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (النور: ٣٣)

واتە: دەبا ئەوانەی هاوسەریان دەست ناکەوێت هەوڵ بدەن داوێنی خۆیان پاک ڕابگرن، هەتا خوا لە فەزڵی خۆی دەوڵەمەندو بێ نیازیان دەکات، ئەو کەسانەش کە دەیانەوێت خۆیان ڕزگار بکەن لە بەندەکانتان و خۆیان بکڕنەوە، ئەوە ئێوە لەگەڵیاندا ڕێک بکەون و ڕێگەی ئازادییان بۆ ئاسان بکەن، ئەگەر خێرتان تێدا بەدی دەکردن و لەو ماڵ و سامانەی کە خوا پێی بەخشیوون بەشیان بدەن و بەزۆر کەنیزەکەکانتان هانمەدەن بۆ داوێن پیسی، ئەگەر ئەوان پاک داوێنیان دەویست (دەبێت پیاوی ئازاد زیاتر پاکداوێنی مەبەست بێت)، بۆ ئەوەی لەو ڕێگەی چەوتەوە ماڵ و سامانی ژیانی دنیا بەدەست بهێنن، جا

ئەوەی بەزۆر ئەو گوناهەیان پێ بکات، ئەوە بەڕاستی خوا دوای ئەو زۆر بۆ هێنانەیان لێخۆش بوو میهرەبانەو چاوپۆشیان لێ دەکات.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا چەندین ڕێنمای گرنگ هەیە لەوانە:

١) گەر کەسێک بۆی هەڵنەسوڕا هاوسەرگیری بکا، جا بە هۆی ئەوەی کەسی گونجاوی دەسنەکەوت، یان پێداویستیەکانی بۆ دابین نەدەکرا ئەوە دەبێ کەسەکە خۆی بپارێزێ لەوەی توشی تاوانی داوێن پیسی بێ، یان بیر لە ڕێگای قەدەغەکراو بکاتەوە بۆ گەیشتن بە هاوسەرگیری، دیارە ئەمە بۆ هەردووک ڕەگەز ڕاستە.
٢) خوای گەورە لە ئایەتەکەی پێشووترو ئەو ئایەتەش بە ئاماژە بەڵێنی دەوڵەمەندبوون و ئاسانکاری داوە بە وانەی کە دەیانەوێ هاوسەرگیری بکەن.
٣) کۆیلەو کەنیزەکەکان مافی ئازادییان هەیەو دەبێ گەورەکانیان بە دەنگیانەوە بێن بۆ ئازادکردن.
٤) ئەرکیان گران نەکرێ بۆ خۆ ئازادکردن، بۆیە دەبێ بە بەش بەش(اقساط) بێ بۆماوەیەکی گونجاو بێ.
٥) گەورەکان دوای ڕێک کەوتن لە سەر پارەو ماوەکە بەشێکیان لێخۆش بن..
٦) ئەگەر کۆیلەکان دەرفەتی ئازادبوونیان نەبوو دەکێ بکرێنە خاوەنی هاوسەری شەرعی و هەموو پێداویستییە مادی و مەعنەویەکانیان بۆ فەراهەم بکرێ.
٧) دەوڵەت بە زەکات و پارەیتر هاوکاریان بێ.
٨) ئافرەت ناچار بکرێ توشی داوێن پیسی بێ جا ڕاستەو خۆ بێ یان وای لێبکرێ لە هەژاری توشی داوێن پیسی ببێ.
٩) ئەگەر بە تۆبزی ناچارکران بۆ خراپەکردن ئەزیەت بدرێن.

١٠) ئەوان ئازادبکرێن و ئەوانە ئازارو سزا بدرێن کە ئەوانیان ناچارکردوە بە زینا.
١١) دەوڵەمەندەکان بە ئەرکی خۆیان هەڵبستن بۆ ئازادکردنیان.
١٢) پارەی نەزرو کەفارەتەکان ڕێکبخرێ بۆ ئازادکردنیان، مەبەست ئەو پارەو غەرامانەیە کە دەبێ کۆیلەی پێ ئازاد بکرێ.

لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێ:

وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْاْ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ (البقرة: ٢٣٢)

واتە: هەروەها ئەگەر ژنانتان تەڵاقداو گەیشتنە کۆتایی عادەی مانگانەیان، ئێوە (ئەی کەسوکاری ژن) مەبنە کۆسپ لە ڕێگەیاندا ئەگەر ویستیان شوو بکەنەوە بە هاوسەرەکانیان، (یاخود ویستیان شوویەکی تر بکەن)، کاتێک ئەوان لە نێوان خۆیاندا ڕەزامەندییان نواند بە شێوەیەکی جوان، ئەم (فەرمان و ڕێنموویيانە) ئامۆژگاری ئەو کەسانەی پێ دەکرێت لە ئێوە کە باوەڕی بە خواو ڕۆژی قیامەت هەبێت، ئەو جۆرە ڕەفتار و کردەوانەتان جوانترو پەسەندترو خاوێنترە، خوای پەروەردگاریش چاک دەزانێرت (چی خێرە بۆتان) و ئێوە نایزانن و دەرکی ناکەن.

وشەی ( فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ) چوار جۆرە کەس دەگرێتەوە:

یەکەم: ئەوانەی لە ژنەکانیان تۆراون دەیانەوێ بگەڕێنەوە لای هاوسەرانیان، ئەوانە نابێ کەس و کاریان ببنە مایەی ڕێگری لێیان نەهێڵن بچنەوە لای مێردەکانیان، ئەوە بەدەقی ئایەت نەهی لێکراوە واتە قەدەغەو بێشەرعییە

دووەم: لێرەدا وشەی( أزواجهن) بە ئیعتیبار داهاتویە، واتە ئەگەر کەسانێک هاتن بۆ داخوازی و کچ و خوشک و ئەوان کە لە ژێر دەستی ئێوەدان بە ئامانجی ئەوەی ببن بە هاوسەریان ئەوە ئێوە ڕێگریان مەبن مادام کەسانی شایستەو باش و گونجاون.

سێیەم: وە ئەوانەش دەگرێتەوە کە عیدەیان تەواو بووە لە دوای تەڵاقداران بە تەڵاقی (رجعی) کە دەیانەوێ شوو بە هاوسەرەکانیان بکەنەوە ئێوە ڕێگریان مەبن.

چوارەم: وە ئەوانەی کە بەتەڵاقی رجعی تەڵاقدراون ویستیان شوو بە هاوسەری داهاتویان بکەن ڕێگر مەبن.

یان ئەوانەی عیدەیان لە هاوسەرانی خۆیان تەواو بووەو دەیانەوێ شوو بە کەسێکی تر بکەن کە لە داهاتوودا دەبنە مێردیان. ئەگەر بە وردی لە ئایەتەکە ڕامێنی ئەوانە هەموو دەگرێتەوە، خوای گەورەش زاناترە.

هەمدیس خوای گەورە دەفەرموێ:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّڪُمُ ٱلَّذِى خَلَقَڪُم مِّن نَّفْسٍ وَٲحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْڪُمْ رَقِيبًا

(النساء: ١)

واتە: ئەی خەڵکینە لە خەشم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن کە ئێوەی لە تاکە نەفسێک دروست کردووە، هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی بەدی هێناو لەو دووانە پیاوان و ژنانی زۆری خستۆتەوە و بڵاوکردەوە، هەروەها لەو خوایە بترسن کە لە یەکتر داوا دەکەن بەناوهێنانی ئەوەوە، هەوڵ بدەن

پەیوەندی خزمایەتیش بپارێزن و (پتەوی بکەن)چونکە بەڕاستی خوا (هەمیشە و بەردەوام) چاودێرە بەسەرتانەوە.

ئەو ئایەتە پیرۆزە ڕێنماییمان دەکات بۆ ئەوەی کە ڕێگای ڕاست و تەندروست بۆ دروستکردنی ژیانی خێزانی لەو ڕێگایەوە دەبێ کە خوای گەورە دیاری کردوە، ئەویش لە ڕێی ئەم دوو ڕەگەزەوە دەبێ ،وە ئەم دوو ڕەگەزە لە یەک سەرچاوە هاتون، وە هەر لەڕێی وانەوە ژیان دەستی پێکردوە،وە ئاگاداریشمان دەکاتەوە کە هەر وەک لە خوای گەورە پارێزدەکەین دەبێ پارێزگاری لە خزمایەتیش بکەین بەوەی کە نەیپچرێنین

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ٱبْنَتَيَّ هَٰتَيْنِ عَلَىٰٓ أَن تَأْجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ (القصص: ٢٧)

واتە: باوکیان پێشنیارەکەی پێ باش بوو بۆیە وتی: من پێم چاکە بتکەم بە کوڕی خۆم، بە زاوای خۆم، یەکێک لەم دوو کچەت لێ مارە بکەم بەمەرجی ئەوەی هەشت ساڵ لای من کار بکەیت، خۆ ئەگەر دە ساڵیشت بردە سەر ئەوەچاکەی خۆتە، منیش نامەوێت بێزارت بکەم و زۆرت بۆ بهێنم، دەمبینیت ئەگەر خوا بیەوێت لە چاکان دەبم؟

کەواتە بە درێژای مێژوو پیاو چاکان ئاسانکارییان بۆ هاوسەرگیری کردوەو لەو بوارەدا فەرمانی خوایان جێبەجێکردوە، وە موسا سەلامی خوای لێبێ هەرچەند مەرجەکە قورس بوو بەڵام موسا لە بەر گرنگی و گەورەیی هاوسەرگیری ملی دا بە جێبەجێکردنی مەرجەکان.

## دووەم: جێبەجێکردنی فەرمانی ڕەسول الله یە صلی الله علیه وسلم( الامتثال لأمر الرسول)

پێغەمبەری خوا هانمان دەدا بۆ هاوسەرگیری بە چەندین شێواز:

**- عَبْدُ اللَّهِ بن مسعود رضي الله عنه قال : كُنَّا مَعَ النَّبِي صلى الله عليه وسلم شَبَاباً لاَ نَجِدُ شَيْئاً ، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهُ صلى الله عليه وسلم : « يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ ، وَ أَحْصَنُ لِلْفَرْجِ ، وَ مَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ »** [١٠] واتە: عەبدووڵای کوری مەسعود ڕەزای خوای لێبێ دەفەرموێ: ئێمە گەنج بووین هیچمان نەبوو، پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام فەرمووی: ئەی کۆمەڵی گەنجان هەرکەس لە ئێوە توانای هەیەو لە خۆی ڕادەبینێ با هاوسەرگیری بکا چونکە هاوسەرگیری باشتر چاو دەگرێتەوەو دامێن باشتر دەپارێزێ، خۆ ئەگەر نەیتوانی هاوسەرگیری بکا ئەوە با بەرۆژوو بێ چونکە رۆژوو پارێزەرەو لە ئارەزووەکانی کەمدەکاتەوەو کۆنترۆڵی دەکا.

**-أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رضى الله عنه أن رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ : « أَمَا وَ اللَّهِ إِنِّي لأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَ أَتْقَاكُمْ لَهُ ، لَكِنِّي أَصُومُ وَ أُفْطِرُ ، وَ أُصَلِّي ووَ أَرْقُدُ وَ أَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي »** .[١١]

دیارە کۆمەڵێک لە هاوەڵان سەردانی ماڵی پێغەمبەری خوایان کردوەو پرسیاریان کردوە دەربارەی خواپەرستیٔ پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام، لە کاتێکدا لەو بارەوە هەواڵیان پێدرا ، وا مەزندەیان دەکرد کە ئەم ئەندازەیە

---

[١٠]- روا البخاري .٥٠٦٦
[١١] - رواه البخاري ، ٥٠٦٣

کەمە، بەڵام دواتر وتیان ئێمە لە کوێ و پێغەمبەری خوا لە کوێ کە خوای گەورە بەخشیویەتی لە هەڵەکانی ڕابردو و داهاتوی، دواتر کە پێغەمبەر گەڕایەوە ماڵەوە هەواڵەکەیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش تەشریفیان هاتە ناو هاوەڵان فەرمووی: ئاگادار بن سوێند بە خوا من لە هەمووتان زیاتر لە خوا دەترسم، وە لە هەمووشتان زیاتر پارێزگاری لێدەکەم، بەڵام من بەڕۆژوو دەبم و دەشیشکێنم مەبەستی ڕۆژووی سونەتە، وە شەونوێژدەکەم و دەشخەوم، وە ژنیش دەهێنم، جا هەرکەس لە سونەتی من لابدا ئەوە لەمن نییە، مەبەست پێ ئەوەیە لە سونەت و ڕێبازی ئەو لایداوە

- قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (ذَا خَطَبَ إِلَيْكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ، وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ، إِلَّا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ، وَفَسَادٌ عَرِيضٌ )[١٢]

پێغەمبەری خوا فەرمویەتی علیه الصلاة والسلام: هەرکەس داخوازی لێکردن، وە ئێوەش لە دینداری ڕازی بوون، ئەوە لێی مارە بکەن دەنا ئاشوب و خراپەکاری فراوان بڵاو دەبێتەوە.

-أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : ( الدُّنْيَا مَتَاعٌ، وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا ؛ الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ) [١٣]

پێغەمبەری خوا فەرموویەتی علیه الصلاة والسلام: دونیا خۆشی و ڕابواردنە، وە خۆشترین خۆشی دونیا ئافرەتی باشە، دیارە ئەوە بۆ ئافرەتیش هەر ڕاستە.

پێغەمبەری ئازیزمان بە کردەیی ئەم هاوسەرگیریەی بە جوانی جێبەجێکردوە، وە فەرمانیشی بە هاوەڵان کردوە، وە هەموو کچەکانیشی بە شوو داوە، وە

---

[١٢] رواه الترمذي، ١٠٨٤

[١٣] واه مسلم ، ١٤٦٧

دواتر هاوەڵان و شوێن کەوتوان و زانایان و پیاو چاکان بەردەوام بوون لەسەر جێبەجێکردنی ئەو پرۆسە گرنگە

## سێیەم: شوێنکەوتنی پێغەمبەران و پیاوچاکانە( الاتباع لسنن الانبياء والصلحاء):

ئەمەش یەکێکە لە ئامانجە گرنگەکانی هاوسەرگیری کە مرۆڤ شانازی ئەوەی دەستدەکەوێ لە گەڵ ئەم کاروانە جوان و پاک و خاوێنە بێ کە پێغەمبەران و شوێنکەوتوەکانیان. پێشتر ئاماژەمان پێدا کە بێجگە لە عیساو یەحیا نەبووە لە پێغەمبەران کە هاوسەرگیری نەکردبێ، (عیسا) سەلامی خوای لێبێ لەدوای ئەوەی کە دادەبەزێتەوە بۆ سەر زەوی هاوسەرگیری دەکا، وە (یەحیا )سەلامی خوای لێبێ هێشتا هەر زۆر گەنج دەبێ شەهید دەکرێ و دەرفەتی ژن هێنانی نەبوە، وە خوای گەورە دەربارەی پێغەمبەران فەرموویەتی **جل جلالە:** وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ (الرعد: ٣٨)

واتە: سوێند بەخوا بێگومان پێش تۆ پێغەمبەرانی ترمان ڕەوانە کردووە و هاوسەرو نەوەشمان پێداون، هیچ پێغەمبەرێکیش بۆی نەبووە بەویستی خۆی موعجیزە نیشان بدات ئەگەر ویستی خوای لەسەر نەبووبێت، بۆ هەموو کارو ڕووداوێکیش بڕیارێکی تایبەت هەیە.

کەواتە بە پێی ئەم ئایەتە پیرۆزە پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەربێ خاوەنی خێزان و مناڵ و وەچەبوون.

## چوارەم: تەواوبونی دینداری( مقصد التدين)

یەکیتر لە ئامانجە گرنگەکانی هاوسەرگیری بریتییە لە کامڵ بون لە ڕووی دینداریيەوە، چونکە بە زۆری تاوانەکان لە دوو ڕێگاوە بۆ مرۆڤ دێن

یەکەم: لە ڕووی گومانەکانەوە( الشبهات) کە ئەمە دەبێ لە ڕووی بیرو باوەڕو زانستەوە وەڵامی بدرێتەوەو خۆت لە مەترسی و کاریگەریەکانی بپارێزی

دووەم: لە ڕووی ئارەزووەکانەوە( الشهوات) کە ئەم ڕێگایە ،هاوسەرگیری باشترین ڕێگایە بۆ ئەوەی ڕێگای لێبگرێ. مرۆڤ لە دوای ئەوەی کە هاوسەرگیری دەکا ئەگەر چاو لەدەر نەبێ تووشی خراپە نابێت.

هەر لەوبارەیەوە پێغەمەری ئازیزمان دەفەرمووێ عليه الصلاة والسلام: ( من رزقه اللهُ امرأةً صالحةً فقد أعانَه على شَطرِ دِينِه فلْيَتَّقِ اللهَ في الشّطرِ الثاني) [14]

واتە: هەر کەسێک خوای گەورە ئافرەتێکی باشی پێبەخشی  ئەوە یارمەتی داوە لە سەر نیوەی دینەکەی، با ئەویش خۆی بپارێزێ لە نیوەی دووەمی، زانایان و پیاوچاکان پێ یان وابووە مرۆڤ تا نەبێتە خاوەنی هاوسەر بەندایەتی تەواو و ساغ نابێ.

هەرچەند فەرموودەکە لاوازە، بەڵام لە مانادا بێکێشەیەو گرفتی لە گەڵ یاسا گشتیەکانی قورئان و سوونەتدا نییە.

**-قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : ( تَخَيَّرُوا لِنُطَفِكُمْ، وَأَنْكِحُوا الْأَكْفَاءَ، وَانْكِحُوا إِلَيْهِمْ.)** رواه إبن ماجه ،١٩٦٨، حكم الحديث: حسن

واتە: کەسانی باش هەڵبژێرن بە هاوسەرینیتان، وە کەسانێ بخوازن کە هاوشانتان بن، وە ئافرەتان بدەن بە کەسانێ کە هاوشانیان بن.

[14] صحيح الترغيب والترهيب ،١٩١٦

## پێنجەم: داوێنپاکی( مقصد العفة)

دیارە ئەم ئامانجەش هەر تەواوکاری ئامانجی پێشوویيە واتە دینداری، بەڵام جیاوازیشی هەیە، زۆر کەس هەیە دینداریش نییە بەڵام حەزی لە داوێنپاکییە، دیارە گومان لەوەدا نییە کە بە پاکمانەوەی مرۆڤ یەکێکە لە ئامانجەکانی شەریعەت، داوێن پاکی ئەو ئاکارە جوانەیە کە هەمیشە مرۆڤە گەورەو جوامێرەکان شانازییان پێوەکردوە، کەسێک داوێن پاک نەبێ لە کۆمەڵگای تەندروستدا بەکەم سەیردەکرێ و کەس متمانەی پێناکا هاوسەرگیری لە گەڵدا بکا، وە لە ئێستادا ئافرەتان لە ڕۆژئاواش متمانەیان بە کەسانی داوێن پیس نییە کە هاوسەرگیریان لە گەڵدا بکەن، هەتا لە ناو زۆربەی زیندەوەرانیشدا سنورو یاساو سزا هەیە بۆ شکاندنی ئەم ئاکارە جوانە، مرۆڤ دەبێ لە خوای گەورە بپاڕێتەوە بۆ ئەوەی داوێنپاک بمێنێتەوە خۆی ماڵ و منالی، خوای گەورەش زۆر باسی دامێن پاکی کردوە وەک دەفەرمووێ: وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ (المؤمنون: ٥) واتە: ئەوانەش کە پارێزەری داوێنی خۆیانن...

## شەشەم: پەیوەندی کۆمەڵایەتی( مقصد العلاقة الاجتماعية)

یەکێک لە ئامانجە گرنگەکانی هاوسەرگیری پەیوەندی کۆمەڵایەتییە

پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام زیاد لەوەی کە لە گەڵ چوار خەلیفەکە پەیوەندی ژینگەیی هەبوو کە هەموویان لە مەکە دەژیان وە پەیوەندی زمانی و دینداریشی هەبوو، سەرەڕای ئەمانەش پەیوەندی خزمایەتی لە گەڵ هەرچواریاندا دروستکرد، کچی لە ئەبوبەکرو عومەر خواست، کچی دا بە عوسمان و عەلی ڕەزای خوا لە هەموویانبێ، بە هۆی هاوسەرگیرییەوە ئەوەی کە ناشی ناسی دەبێ بە برادەری گیانی بە گیانی، دوای ماوەیەک دەبێ بە خاڵ و مام و بابەگەورەو دایە گەورە پەیدادەبێ، خزمایەتی تۆکمە پەیدا دەبێ خزمایەتی بەرفراوان دەبێ، یەکترناسین و بە هاناوەچوون زیاتر دەبێ.

## حەوتەم: فراوانبوونی بازنەی بەرپرسیاریەتی(مقصد توسع وتحمل المسؤولية)

کچ و کوڕ تا لە ماڵی باوکیان بن هەست بە بەرپرسیاریەتی گەورە ناکەن، زۆربەی کارەکان بە باوک و دایک و لە خۆیان گەورەتر دەسپێرن،

کوڕو کچ لە دوای ئەوەی کە دەبن بە هاوسەر دەبێ بیر لە ئەرکەکان و مافەکانیان بکەنەوە، دەبێ بزانن بەرامبەر بە یەک ئەرکیان چیە، بەرامبەر منداڵەکانیان ،بەرامبەر ماڵی خەسو و خەزوران، لە گەڵ جیرانەکان، دەبێ بزانن چۆن لە گەڵ یەکدا مامەڵە دەکەن، کە بیرۆکەو تەبیعەتیان جیاوازبوو چۆندەبێ خۆیان بگونجێنن، دەبێ بیر لە داهاتوی خۆیان و منداڵەکانیان بکەنەوە، دەبێ ڕووبەڕووی کێشە ئابوری کۆمەڵایەتیەکان ببنەوە، هەتا ڕۆژێک تێپەری منداڵەکانیان گەورەتر بن بەر پرسیاریەتیان زیاد دەکا، ئەوان وەک دوو چۆلەکە یان دوو کۆتر وان لە هێلانەی چەند ساڵەیان هەڵفریون دەبێ بیر لە هێلانەی تازە بکەنەوەو وردە وردە دروستی کەن، باوکان و دایکان دەبێ ئەو لەحزەی ماڵئاواییە بقۆزنەوە بە ئامۆژگاری جوان بۆ منداڵەکان، بە تایبەتتر دایکان، یەکێ لەو دایکانە بە کچەکەی دەڵێ:

(( ئەی کچەکەم!

تازە تۆ لە ماڵەکەی پێشووترت جیابوویەوە، وە لەو هێلانەیە دەرچوی کە تێیدا فراژوو بووی بۆ هێلانەیەک کە پێیەوە ڕانەهاتووی، وە بۆ ڕەفیقێک کە پێی ئاشنانی. بۆ هاوسەرەکەت ببە کەنیزەک ئەویش بۆتدەبێ بە کۆیلە. ڕۆڵەکەم لە دە شت ئاگاداری هاوسەرەکەت بەو بۆی بپارێزە.

یەکەم و دووەم: بە قەناعەتەوە لە گەڵی بژی، وە گوێڕایەڵی بەو فەرمانبەرداریبە بە چاکە

سێیەم و چوارەم: ئاگات لە جێ چاوەکانی بێ و ئاگات لە شوێنی لوتی بێ، با بە ناشیرن و دزێو نەتبینێ و بۆنی ناخۆشت لێنەکا، کل لە جوانترین و باشترینی جوانیەکانە، وە ئاو و سابون پاکترینی پاکیەکانن

پێنجەم و شەشەم: ئەی کچەکەم وریای کاتی خواردنی بەو ئارامی کاتی خەوی بپارێزە، چونکە ئاگری برسیایەتی سوتێنەرە،وە تێکچونی خەو بەڵا دروستدەکا

حەوتەم و هەشتەم: ئاگات لە غورفەکەیماڵەکەی بێ، وە چاوەدێری خۆی منداڵەکانی بە

نۆیەم و دەیەم: سەرپێچی فەرمانەکانی مەکە، وە نهێنیەکانی ئاشکرا مەکە، چونکە ئەگەر فەرمانیت شکاند کینە لە دڵی دروستدەکەی، وە ئەگەر نهێنیت نەپاراست دڵنیانابی لە تۆڵەو غەدری. جا لەدوای ئەمانە نەچی دڵخۆشبی لە کاتی خەمباری ئەو، وە نەچی خەمبار بی لە کاتی دڵخۆشی ئەو، چونکە هی یەکەمیان کەمتەرخەمییە، هی دووەمیان تاڵ و لێڵکردنە هەتا تۆ زیاتر بەگەورەی بزانی، ئەو زیاتر ڕێزت دەگرێ. ناگەی بەوەی کەمن پێم وتی هەتا ڕەزامەندی ئەو بەسەر ڕەزامەندی خۆتدا هەڵنەبژێری، وە خۆشی ئەو بەسەر خۆشی خۆتدا لەوەی کە پێت خۆشەو پێت ناخۆشە، خوای گەورە خێرت بۆ دێنێتە ڕێت.))

کەواتە لێرە پەرپرسیاریەتی تەنیا بۆ کچ و کوڕەکە نییە بە تەنیا بەڵکو دەبێ باوکان و دایکان دەوری مامۆستایی بگێڕن و ڕێنماییان کەن، وە لە زۆر جێکا لەسەر دەستی کەسانی پسپۆر دەورەو وۆرک شۆپی تایبەت دەکرێتەوە بۆ ئەوکەسانەی کە دەیانەوێ هاوسەر گیری بکەن، وە لەو بوارەدا زۆر کتابی باش هەیە هەتا بە کوردیش ، هەم بە شێوەی شەرعی هەم بە شێوەی زانستی، ئەم فەرهەنگەی بەردەستمان کە تەواو بێ بە پشتیوانی خوا دەبێتە ڕێنماییکەرێکی باش و یارمەتە دەرێکی باش هەم بۆ ئەوانەی کە دەیانەوێ

هاوسەرگیری بکەن، وە هەم بۆ ئەوانەی کە چوونە ناو پرۆسەکەوەو وە ئەوانەش بوونە دایک و باوک و وەهەتا بابەگەورەو دایەگەورەش.

## هەشتەم: دەستکەوتنی ڕزق و ڕۆزی( مقصد کسب الرزق)

زۆربەی گەنجان کە هاوسەرگیری ناکەن لە وڵاتی ئێمە لە بەر گرفتی مادییە، ئەمە تا ئەندازەیەک ڕاستە بەڵام نابێ ببێتە کۆسپ هەتا کۆتایی لە بەر سێ هۆ:

**یەکەم:** خوای گەورە بەڵێنی دەوڵەمەند بوونی داوە بەو کەسانەی هاوسەرگیری دەکەن وەک دەفەرموێ: وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ إِن يَكُونُوا۟ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ (النور: ٣٢)

(إِن يَكُونُوا۟ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ :واتە ئەگەر هەژار بوون خوای گەورە دەوڵەمەندیان دەکات)

لە ئایەتەکی دواتریش دەفەرموێ: وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ... (النور: ٣٣) واتە: با ئەوانەی ناتوانن هاوسەرگیری بکەن خۆیان بپارێزن هەتا خوای گەورە دەوڵەمەندیان دەکات.

**دووەم:** پێغەمبەری ئازیزیش بەڵێنی دەڵەمەندبوون و ڕزق و ڕۆزی داوە، وەک دەفەرموێ: ( ثَلَاثَةٌ حَقٌّ عَلَى اللَّهِ عَوْنُهُمْ : الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَالْمُكَاتَبُ الَّذِي يُرِيدُ الْأَدَاءَ، وَالنَّاكِحُ الَّذِي يُرِيدُ الْعَفَافَ. )[١٥]

واتە: سێ کەس حەقە لە سەر خوای گەورە کە هاوکاریان بکا، دیارە کەس ناتوانی هیچ شتێک لەسەر خوا پێویست بکا، بەس خوای گەورە لە بەخشندەیی خۆی بەڵێنی یارمەتیدانی داوە، ئەو کەسەی کە لە پێناوی خوا

[١٥] رواه الترمذي ،١٦٥٥

تێدەکۆشێ، وە ئەو کەسەی لە گەڵ گەورەکەی مامەڵە دەکا بۆ ئازادکردنی خۆی، وە ئەو کەسەش کە دەیەوێ ژن بێنێ بۆ خۆ پاراستن لە گوناهو تاوان.

سێیەم: بە بەڵگەی واقعی و کردەیی سەلمێنراوە کە ئەوانەی زەواج دەکەن بە چاکی و پاکی بەرەو ڕزق و ڕۆزی فراوان دەچن، ئەمەش هۆکارەکەی ڕوونە چونکە کەسەکە دەبێ بە دووی ڕزق و ڕۆزیدا بگەڕێ و ژیانی ماڵ و مناڵی دابین کا، وە مرۆڤیش کە هەوڵی دا ڕەنج بە خەسار نابێ، ئەم یاساییە، هەم شەرعییە ، هەم گەردوونییە، زۆرن ئەوانەی لە ماڵی باوکیان پێش هاوسەرگیری خاوەنی هیچ داراییەک نەبوون بەڵام ئێستا خودا پێداو و دەوڵەمەندن.لێرەشدا دەبێ ئەوە لە یاد نەکەین:

١. دەوڵەت ئەرکی لەسەر شانە ئاسانکاری بۆ هاوسەرگیری بکات بە هەموو شێوەیەک.
٢. دەوڵەمەندەکان بە پارەی خێرو زەکاتیش پێویستە هاوکاربن بۆ ئەو پرۆسە گرنگە.
٣. باوکان و دایکان ئاسانکاری بکەن بۆ کەمکردنەوەی پێداویستیەکانی هاوسەرگیری.
٤. کچ و کوڕەکانیش دەبێ لە ئەندازەی توانای مادی خۆیان داواکارییان هەبێ.
٥. میدیاش دەوری هەیە بە گواستنەوەی نموونەی جوان و هاندان بۆ هاوسەرگیری.
٦. ڕێکخراوەکان دەتوانن ڕۆڵ بگێڕن لەو بوارەدا.

## نۆیەم: ئارامی و دڵنیایی( مقصد السكينة والاطمئنان)

یەکیتر لەو ئامانجە گرنگ و جوانانەی کە لە هاوسەرگیریدا هەیە بریتییە لە ئارامی و ئۆخژنی لاشەو دەرونی، مرۆڤ کە ماڵی خۆی هەبوو تەواو هەست بە ئازادی و ئارامی دەکا، هەم لە کارەکانی، هەم لە پلانەکانی، چونکە ماڵ بۆ

مرۆڤ سندوقی نەهێنیەکانە، وە دەتوانی بە ئارامی بخەوێ ئیسراحەت بکا، میوانداری خەڵک بکا، چاکەو بەخشندەیی بکا، خوای گەورە باسی ئەو ئارامی خوشییەی کردوە کە لە ماڵی خێزا نیدا هەیە وەک دەفەرموێ: وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجً وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (الروم: ٢١)

واتە: یەکێک لە نیشانەو بەڵگەکانی تری ئەوەیە: کە هەر لە خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەلایداو لە نێوانتاندا خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانی فەراهەم هێناوە، بەڕاستی ئا لەو دیاردانەدا نیشانەو بەڵگە هەیە بۆ کەسانێک بیردەکەنەوەو تێدەفکرن.

(لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا) بە هۆی هاوسەرانتان ئارامیتان دەست دەکەوێ.

خێزان خۆی ئارامییە.

خزمەتەکانی ئارامی بەخشە.

خۆشیەکەی ئارامی بەخشە.

مناڵەکانی ئارامی بەخشە.

مەحرەمبونەکەی ئارا می بەخشە.

یارمەتیدانەکەی لە هەموو بوارێکەوە ئارامی بەخشە.

شایانی باسە خودی ماڵ و شوێنی حاوانەوە خۆی سەکینەتە وەک خوای گەورە دەفەرموێ: وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمْ سَكَنًا (النحل: ٨٠) واتە: خوای گەورە گێڕاویەتی لە ماڵەکانتدا ئارامی و دڵنیایی.

بەڵام نابێ ئەوەمان لە یاد بچێ کە ماڵ بکەینە ئارامگای لاشەی و دەرونی خۆمان و منداڵەکانمان، نەوەک لە بەر گرفت و کێشە سەر لە خۆمان و منداڵەکانیشمان بشێوێنین وەک ئێستای کۆمەڵگاکان بە زۆری بە داخەوە.

## دەیەم: خۆشەویستی( مقصد المحبة)

خوای میهرەبان دەفەرموێت: وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ

واتە: یەکێ لە ئامانجەکانی هاوسەر گیری ( مودة) واتە خۆشەویستی، بنچینەی ڕاوەستانی ئەم گەردوونە لە سەر خۆشەویستییە، چونکە مرۆڤ کەسێکی خۆشناوێ کە گونجاویان لە نێواندا نەبێ، مرۆڤ بونەوەرێکە خۆشەویستی تێیدا قوڵە ، مرۆڤ بە دەست خۆی نییە هۆگری شتەکان دەبێ

خوشەویستی لە مرۆڤدا غەریزەیەکی قوڵە.

خۆشەویستی لە مرۆڤدا کانیەکی هەمە چەشنەیە.

خۆشەویستی بۆ خوا شتێکەو جیاوازە لە خۆشەویستی بۆ شتەکانی تر.

خۆشەویستی بۆ دایک و باوک جیاوازە.

بۆ ماڵ و سامان جیاوازە.

بۆ منداڵ و نەوەکان جیاوازە.

بۆ خوشک و براو کەسەکان جیاوازە.

هەروەک چۆن خۆشەویستی بۆ هاوسەر جیاوازو تایبەتە.

خۆشەویستی بۆ خێزان سەرچاوەی زۆربەی خۆشەویستیەکانە، چونکە خۆشەویستی بۆ منالٚ تێی ناگەی تا هاوسەرگیری نەکەی

خۆشەویستی بۆ نەوەکان بە بێ ئەم هەنگاوە ناکرێ، ئەم خۆشەویستیە جوانیەکەی لەوەدایە کە وەفاو و هاوکاری دروستکا. لە بیرنەکردن دروست بکا، هەروەک چۆن پێغەمبەری ئازیز هیچ کات خەدیجەی لە بیر نەدەکرد، باسی دەکرد ڕێزی لە هاوڕێکانی دەگرت، ئەگەر خێرێکی بکردبا هاوڕێکانی خەدیجەی لە بیر نەدەکرد، ئەگەر سەردانی پێغەمبەریان بکردبا ڕێزی تایبەتی لێدەگرتن. خۆشەویستی کانیاوێکی مەعنەوییە هەرگیز وشک ناکا، بەڵام لێکەوتەو شوێنەوارەکانی مادین و دەبینرێن،

خۆشەویستیی سەبر بە مرۆڤ دەدا، قوربانی بە مرۆڤ دەدا، بەخشندەیی بە مرۆڤ دەکات .

ئەگەر بێت و ڕیزبەندی لە خۆشەویستیدا بکەین ئەوە دوای خوداو پێغەمبەرەکەی کەس بە قەدەر دایک و باوک پاشان خێزان خۆشەویست نییە.

هەرچەند من پێم وایە خۆشەویستیەکان جیاوازن لەوانەیە ئەوا ڕیزبەندی بکەین باشترە، لەوەی کە بڵێین کامەیان زیاترە، بە هەر حاڵ نمونەی خۆشەویستیمان بیستوە بۆتە چیرۆک دەماو دەم دەگێرڕێتەوە، بەڵام بەداخەوە خەریکە خۆشەویستی مەسارو ڕێگای خۆی دەگۆڕێ، خەڵک لە مرۆدا خۆشەویستی حەرامدەکا بەڵام خۆشەویستی حەڵاڵ ناکا، زۆرجار قوربانی بە حەڵاڵ دەدرێ لە پێناو حەرامدا. وە خۆشەویستی جاری وایە دەچێتە بازنەی هاوبەش پەرستیەوە بۆیە دەبێ وریابین، وەک خوای گەورە دەفەرموێ: وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ

(البقرة: ١٦٥) واتە: (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانەدا) هەندێک کەس هەیە لەجیاتی ئەوەی خواپەرست بێت، شتانی تر دادەتاشێت بۆ خۆی و (شوێن ڕێنموویيەکانی خوا ناکەوێت و) خۆشەویستی و سۆزی دەدات بەو بت و بەرنامۆلکەو تووله ڕێگەیانە و خۆشی دەوێن، وەک چۆن ئیمانداران خوایان خۆش دەوێت، بەڵام ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە زۆر زیاتر خوایان خۆش دەوێت (هەر بەراورد ناکرێت) جا ئەوانەی کە ستەمیان کردووە گەر دەیانزانی لە کاتێکدا کە بەچاوی خۆیان ڕووبەڕووی ئەو سزایە دەبنەوە، کە بەڕاستی بۆیان دەردەکەوێت کە هێزو تواناو دەسەڵات هەر هەمووی بە دەست خوایە و دڵنیا دەبوون کە ئەو خوایە سزاکەی زۆر بە ئازارە (بۆ ستەمکاران).

## یازدەیەم :بەزەیی و میهرەبانی( مقصد الرحمة والرأفة)

یەکیتر لە ئامانجە گرنگەکانی هاوسەرگیری دروستبونی خۆشەویستی و میهرەبانییە لە نێوان ژن و مێردا، مەرج نییە پەیوەندی لە نێوان هاوسەراندا تەنیا پەیوەندی سێکسی بێ، بە تایبەت لە دوای تێپەڕاندنی تەمەنی گەنجی و توانای سێکسی نامێنێ، دوای ئەوە قۆناغیتر دێتە ئاراوە ئەویش بە زەیی بە یەکترا هاتنەوەیە ، ئەوجار نۆبەی وەفایە، بیرکەوتنەوەی ئەو هەموو یادگاریەییە لە نێوانیاندا، بە پێچەوانەی تێڕوانینی مادیگەرای کە بەردەوام بە ڕوانگەی سێکسی دەروانن بۆ پەیوەندی نێوان ژن و مێرد، هەر بۆیە ئەگەر یەکێکیان تۆزێک توشی لاوازی سێکسی بوو بە جێی دێڵێ و هیچ بەزەییەکی بۆی نیەو زۆری پێ ئاساییە، ئێمە ئەگەر دەڕوانین بۆ کوردەواری خۆمان لە دوای وەفاتی یەکێکیان هەتا بە تەمەنی پیریش هەزار ئاخ و ئۆف بۆ یەکتر دەکەن، ئەمە ئەو بەزەییە کە قورئانی پیرۆا باسی دەکا.

## دوازدەیەم: تێرکردنی ئارەزوی جنسییە(مقصد إشباع الغريزة الجنسية)

خوای گەورە کە نێرو مێی دروستکردوە لە وانیشدا ئارەزوی جنسی بۆ یەکتر تێدا داناون. بە هۆی ئەم ئارەزوە ڕەوڕەوەی ژیان بەردەوام دەبێ، خۆشەویستی و هاوکاری و وەفا بۆ یەکتر دروست دەبێ، منالّ دەکەوێتە نێوانیان، پەیوەندیەکان تۆکمەتردەبن، کەواتە باس کردنی لایەنی ئارەزو لە مرۆڤدا نە خراپەو نە عەیبەیەو نە تاوانە، ئەوەی کە جێگای نیگەرانییە ئەوەیە کە ئەم ئارەزوە لە خراپەو ناشەرعیدا خالّی بکرێتەوە، دواتر لە بابەتی تەندروستی باسی دەکەین، وە هەروەها لە باسی مافەکان و  لە باسی بەختەوەری و لە باسی گرفتەکانیش باسی دەکەین، چۆنکە بابەتی جنسی زۆر گرنگەو پەیوەندی بە زۆر لایەنەوە هەیە، ئارەزوی جنسی وەک غەریزەیەک ژیانی پێوە بەندە، وە پێویستە، وە دەبێ جێبەجێبکرێ، وە دەبێ ڕێنمایی وردیش لەو بوارەدا هەبێ کە سوپاس بۆ خوا، ئیسلامی گەورەو فراوان ئەوپەری گرنگی بەو لایەنەو هەر لایەنێکی پێویست و گرنگی ژیانی مرۆڤایەتی داوە چ لەسەر ئاستی تاک، یان خێزان، یان کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ،وە لەوەش فراوانتر بۆ دین و دونیاو و دونیاو دوارۆژ، گرنگ ئەوەیە بابەتی جنسی لە ئامانجی خۆی لانەدرێ ژیانی پێ وێران نەکرێ، دەبینین لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان، لەسەری بابەتی جنسی خیانەتی هاوسەری ئەنجام ئەدرێ، وە لەسەری منالّ لە بەردەمی کەنیسەکان و زبڵدان و بازارەکان فرێ ئەدرێ، بەداخەوە مرۆڤ بەوە ڕاناوەستاوە کە بتوانی ئەم غەریزەیە لە جێی خۆیدا بە کار بێنێ بەڵکو لێی بۆتە قومبەلەیەکی ترسناک بەسەریدا تەقیوەتەوەو ماڵی وێران کردوەو لە مەساری خۆی لایداوەو خێزان پێی هەڵتەکاوە.

## سێزدەیەم: سەربەخۆیی( مقصد الاستقلالیة)

مرۆڤ بە سروشتی خۆی حەزی لە ئازادییە، هەوڵی بۆ دەدا، خەباتی لە پێناودا دەکا،بۆیە هاوسەرگیریی یەکێکە لە ڕێگاکانی گەیشتن بەسەربەخۆیی، لەوانەیە کچ یان کور کۆمەڵێک حەزو داخوازی هەبێ بیەوێ بیهێنیتەدی بەڵام ناتوانی لە ماڵی باوکیدا ئەوە بکا، بەڵام ئەگەر ماڵی خۆی هەبوو ئازادە، مەرج نییە ئەم حەزو ویستانە خراپ بن، لەوانەیە میوانداری کەسێک بێ، یان ئیسراحەت، یان شێوازی ژیان، یان خواردن، یان سەیارەو کەل و پەل بێ، بۆیە کچ و کوڕ بە هاوسەرگیریان تەواو هەوای ئازادی و سەربەخۆیان هەڵدەمژن.

## چواردەیەم: هاوکاری یەکترکردن( مقصد التعاون بین الزوجین)

هاوکاری یەکتری کردن سیمایەکی گەردوونییە لە کەهکەشانەوە تا مێرویەک و بەکتریایەک و فایرۆسێک، جا بەتایبەت خێزان زیاتر پێویستی بە هاوکارییە، وە زیاترو پێویستریش هاوسەران، ئەگەر پیاو ئەرکی دەرەوە جێبەجێ بکا، ئەوە ژن ئەرکی ماڵەوە بە ئەستۆ دەگرێ کە هیچی لە هی پیاو کەمترنییە بەڵکو فرانترو گرنگتریشە، ئافرەت وێڕای ئەوەی کە ئەرکەکانی ماڵەوەش جێبەجێدەکا دەبێ مناڵەکان بە خێو بکاو پەروەردەشیان بکا،پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام لە ماڵەوە زۆر هاوکاری خێزانەکانی بووە وەک دایکمان عائیشە ڕەزای خوای لێبێ پرسیاری لێکرا دەربارەی پێغەمبەر کە لە ماڵەوە بە چیەوە سەرقاڵە علیه الصلاة والسلام: (؟ قَالَتْ : كَانَ يَكُونُ فِي مِهْنَةِ أَهْلِهِ - تَعْنِي خِدْمَةَ أَهْلِهِ - فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ ،[١٦]

---

[١٦] رواه البخاری، ٦٧٦

ئەویش فەرمووی پێغەمبەری خوا لە خزمەتی ماڵ و منالّی دابوو، کاتێک کە کاتی نوێژ دەهات دەردەچوو بۆ نوێژ.

پرسیار لە دایکمان عائیشە کرا دەربارەی ئیش و کاری پێغەمبەر لەماڵەوە فەرمووی : وەک هەرکام لە ئێوە ئیش و کار دەکات.

( كَمَا يَصْنَعُ أَحَدُكُمْ ؛ يَخْصِفُ نَعْلَهُ وَيُرَقِّعُ ثَوْبَهُ. ) حكم الحديث: حديث صحيح،[١٧]

واتە: پێغەمبەری خوا نەعلەکانی چاک دەکردو بەرگ و پۆشاکەکانی پینە دەکرد، ئەمە وێڕای ئەوەی پێغەمبەری خوا ژمارەی خێزانەکانی زۆر بووەو پێویستیان بەو نەبووە، هاوسەران لە هەموو قۆناغەکانی ژیان پێویستیان بە یەکترە بە تایبەت تر ئەو کاتەی کە یەکێکیان نە خۆشە یان زۆر سەرقاڵە، یان ژمارەی منالّەکان زۆرن، یان ئەرکی پیاو قورسە، یان کە میوان لە ماڵەوە هەبێ ئەوە دەبێ لەو کاتانەدا زیاتر هاوکاری یەکتربن، وە ئەوکاتەش کە بەتەمەندا دەچن. ئەگەر هاوکاری لە نێوان هەموو مسوڵماناندا پێویست بێ ئەوە لە نێوان هاوسەراندا پێویستترە.

## پازدەیەم: یەکترناسین( مقصد التعارف)

لەوانەیە مرۆڤ خۆی باش نەناسێ تا هاوسەرگیری یان هاوڕێیەتی نەکا ئەمەش سەیر نییە، چونکە بەبێ تاقیکردنەوەو بەریەککەوتن هەموو کەس لە خۆی ڕازییەو زۆر لە خۆی ڕادەبینێ. هاوسەرگیری:

١. ئافرەت بە پیاو دەناسێنێ.
٢. پیاو بە ئافرەت دەناسێنێ.
٣. بە سروشتی یەکتر شارەزا دەبن.
٤. بە تالّی و شیرنیەکانی ژیان ئاشنا دەبن.
٥. بە هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتی ئاشنا دەبن.

---

[١٧] رواه احمد، ٢٤٧٤٩.

٦. بە ئەرک و مافەکانیان ئاشنا دەبن.
٧. بە سروشتی مەینەتی و ئازار ئاشنا دەبن.
٨. بە یادگاری و خۆشیەکان ئاشنا دەبن.
٩. بە سروشتی مناڵ شارەزا دەبن.
١٠. بە هەستی دایکایەتی و باوکایەتی ئاشنا دەبن.

بۆیە هاوسەرایەتی قووتابخانەی ئاشنابوونە بە یەکترو بە تەواوی شتەکان.

ئەگەر ( لتعارفوا) بۆ هەموو مرۆڤایەتی و ئامانج بێ و پێویستبێ گومان لەوەدا نییە کە بۆ هاوسەران گرنگترو پێویسترە، هەڵەکانی مرۆڤ زۆربەی سەرچاوەکەی نەزانی و بێ تەجروبەییە لە ڕاستیەکانی ژیان، گەنجێک پێش ئەوەی بچێتە ناو پرۆسەی هاوسەرگیری دوای ساڵێک لە پرۆسەکە بۆی بڕوانە بزانە چۆن گۆڕاوە، بیرکردنەوەکانی جیاوازن، زیاتر هەستی بەرپرسیاریەتی لادروست بوە، ئارامی زیاتربووە، دینداری بە هێزتربووە، تێگەیشتنی بۆ شتەکان جیاوازتربووە.

## شازدەیەم:پەیابوونی منال( مقصد التناسل)

گومان لەوەدا نییە کە منال زۆر ئازیزو خۆشەویستە، یەکێکە لە خۆشترین و جوانترین بەهرەکانی پەروەردگار، ئەو کەسەی هەیەتی دەبێ شوکری خوای لەسەربکاو هەوڵی پەروەردەکردنی بداو نزای چاکبونی بۆ لە پەوەردگار بکا، ئەوەش کە نیەتی دەبێ نزا بکاو هەوڵی بۆ بدا، بەلام ئەگەر نەبێ دەبێ بە قەدەری خوا ڕازیبێ ،گومان لەوەدا نییە لەسەر ئەم ئارامگرییە پاداشتی گەورەی لای پەوەردگار دەست دەکەوێ، پەیابونی منال هۆی بەردەوامبونی ژیانە، منال خۆشی ژیانەو و میوەی دڵەو ڕووناکی چاوە، هەربۆیە ئەم بابەتە لە قورئان و سونەتدا تەواو گرنگی پێدراوە بە چەندین شێواز باسکراوە.

خوای گەورە دەفەرموێ: ...فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُواْ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ... (البقرة: ١٨٧)
واتە: ئێستا لەمەودوا بڕۆن بۆ لای هاوسەرانتان لە شەوانی ڕەمەزاندا گوناهبار نابن، وە ئەوە بخوازن و داوا بکەن کە خوای گەورە بۆی نوسیون، کە زانایان دەفەرموون مەبەست پێی منداڵی سالح و داوێن پاکییە، کەواتە منداڵی سالح یەکێکە لە ئامانجەکانی هاوسەرگیری.

نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَـٰقُوهُ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ (البقرة: ٢٢٣)

واتە: هاوسەرانتان کێڵگەی ئێوەن بڕۆن بۆلایان چۆن حەز دەکەن، وە کاری باش پێش خۆتان بخەن، دیارە یەکێ لەو کارە باشانە نیەتی دورکەوتنەوە لە تاوان وەدەستخستنی وەچەی باشە.

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا (النساء: ١)

واتە: ئەی خەڵکینە لە خەشم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن کە ئێوەی لە تاکە نەفسێک دروست کردووە، هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی بەدی هێناو لەو دووانە پیاوان و ژنانی زۆری خستۆتەوە و بڵاوکردەوە، هەروەها لەو خوایە بترسن کە لە یەکتر داوا دەکەن بەناوهێنانی ئەووەوە، هەوڵ بدەن پەیوەندی خزمایەتیش بپارێزن و (پتەوی بکەن)چونکە بەڕاستی خوا (هەمیشە و بەردەوام) چاودێرە بەسەرتانەوە.

دەبینین ژن و پیاو سەرچاوەی بونیان یەکە، لەم دوو هاوسەرە منداڵەکان پەیدا بوون و هەر بە هۆی ئەم هاوسەریەش ژیان بەردەوام دەبێ ،نەوەک بە نێربازی و هاوڕەگەز بازی.

هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ (آل عمران: ٣٨) واتە: ئا لەو کاتەدا پاڕایەوە زەکەریا لە پەروەردگاری وتی: ئەی پەروەردگارم پێم ببەخشە لەلایەنی خۆتەوە کوڕێکی سرووشت پاک بەڕاستی تۆ بیسەری پاڕانەوەیت.

زەکەریان سەلامی خوای لێبێ لە دوای پیری و نەزۆکی خێزانەکەی هێشتا داوای منالّی کرد لە خوای پەروەردگار کە بەسەر هەموو شتێکدا توانادارە.

وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا (الفرقان: ٧٤)

واتە: ئەوانەشن کە دەڵێن: پەروەردگارا لە هاوسەران و نەوەکانمان کەسانێکمان پێ ببەخشە کە ببنە مایەی ڕووناکی دیدەمان و شادمانی دڵمان و بمان کە بە پێشەوا بۆ پارێزکاران و خواناسان.

دەبینین بە ندەکانی خوا لە خوای گەورە داوای چاوڕوونی دەکەن لە دین و دونیا بە هۆی خێزان و ماڵ و منالّی باش

وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ (النحل: ٧٢) واتە: خوا هەر لە خۆتان هاوسەرانی بۆ فەراهەم هێناون، هەر لە ڕێگەی هاوسەرانتانەوە کوڕو کوڕەزای پێبەخشیوون و لە هەموو ڕزق و ڕۆزیەکی چاک و پاک و بەسوود بەهرەوەری کردوون، (لەگەڵ ئەو ڕاستیانەدا) ئایا ئەوانە هەر بڕوا بەشتی پووچ و ناحەقی دەکەن و لە بەرامبەر نازو نیعمەتەکانی خواوە ئەوانە هەر ناشوکرو سوپاس ناپەزێری و بێ باوەڕ دەبن؟

خوای گەورە هەتا باسی بەرهەو نیعمەتی نەوەکانیش دەکات.

ئیبراهیم لە دوای تەمەنی پیری و نەزۆکی خێزانەکەی هێشتا داوای مناڵی ساڵح دەکات: رَبِّ هَبْ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ (الصافات: ١٠٠) واتە: ئەی پەروەردگارم مناڵێکی چاکم پێ ببەخشە. خوای گەورەش نزاکەی گیراکردو بەو تەمەن و حاڵەوە مناڵی پێبەخشی نەوەک هەر مناڵ بەڵکو خوای گەورە مزگێنی نەوەشی پێدان لە گەڵ (خاتو سارای ) خێزانی وەک دەفەرموێ:

وَٱمْرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ (هود: ٧١) واتە: لەو کاتەدا خێزانەکەی وەستابوو، یەکسەر پێکەنی، جا (خوای گەورە فەرمووی): ئێمەش مژدەمان دایە کەئیسحاقت پێدەبەخشین و لە دوای ئەویش یەعقوب، لە نەوەی ئیسحاق دێتە دنیاوە.

وە لەچەندین فەرمودەدا هاندان کراوە بۆ دەستخستنی مناڵ و هاوسەرگیری لە گەڵ کەسانێک بکرێ کە مناڵیان دەبێ ، ئەمەش یەکێک لە ڕێگاکانی ئەم زانیارییە، کەس و کاری کەسەکەیە، وە لە ئێستادا هۆکارەکانی زانستی پێشکەوتوەو زۆر شت دەزانرێ، بەڵام دەبێ یەقینمان هەبێ هەتا خوای گەورە مناڵ نەدا نابێ، وە مەرج نییە بەردەوام لە هۆکاری مناڵ نەبوون سەرنجمان لای ئافرەت بێ بەڵکو جاری وایە هۆکارەکە پیاوە، وە ئەویش دەبێ بە دوو چارەسەری خۆیدا بگەرێ بە پێی توانا لە دوای نزاکردن لە خوای پەروەردگارو خێرکردن.

پێغەمبەری خوا دەفەرموێ عليه الصلاة والسلام: ( جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ : إِنِّي أَصَبْتُ امْرَأَةً ذَاتَ حَسَبٍ وَمَنْصِبٍ، إِلَّا أَنَّهَا لَا تَلِدُ، أَفَأَتَزَوَّجُهَا

؟ فَنَهَاهُ، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّانِيَةَ فَنَهَاهُ، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّالِثَةَ فَنَهَاهُ، فَقَالَ : " تَزَوَّجُوا الْوَلُودَ الْوَدُودَ ؛ فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمْ.) حكم الحديث: حسن صحيح، [١٨]

واتە: پیاوێک هات بۆلای پێغەمبەری خوا وتی: من ئافرەتێکی خاوەن پایەو ڕەچەڵکم خواستووە، بەڵام منالی نابێ، ئایا زەواجی لەگەڵدا بکەم؟ پێغەمبەریش نەهی لێکرد، لە جاری دووەمدا هاتەوە دیسان ڕێگری لێکرد، لە جاری سێیەمدا پێی فەرموو: ئافرەتانێک بخوازن کە مێردۆستن و منالیان دەبێ، من لە دوا ڕۆژدا شانازیتان پێوە دەکەم.

## بەرچاوڕوونییەک!

لێرەدا دەبێ ئەوە بڵێین حەرام نییە کە ژنێکی لەو جۆرە بخوازی، چونکە پێغەمەبەری خوا لە هەموو خێزانەکانی تەنیا لە خەدیجەو ماریە منالی بووە. ئەوەی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی هاندان بووە، ئەم هاندانیشە بۆ خۆ چارەسەرکردن.

## حەڤدەیەم:هاوڕێی باش( مقصد الصداقة)

مرۆڤەکان پێویستیان بە هاوڕێیە، هاوڕێ پشتیوان و دڵخۆشکەرو جێگای ڕازو نیازە، جا چ هاوڕێیەک لە هاوسەر هاوڕێترو خاوەن ڕازو نیازترە؟ بێگومان یان نییە یان زۆر کەمە، ئەگەر هاوڕێکەت لێتدادەبڕێ بە هۆی ئیش و کار یان سەفەری دوور، یان چوون بۆ شارێکیتر ئەوە هاوسەرەکەت هەر لە گەڵتایە تا ئەوکات بە یەکجاری لە یەکتر ماڵئاوایی دەکەن، بۆیە دەبێ هاوسەران وێڕای خۆشەویستی هاوسەرایەتی دەبێ جوانی و تامی هاوڕێیەتیش بخەنە ناو ژیانیانەوە. واتە هاوسەرایەتی بە تامی هاوڕێیەتی و دڵ بە یەکتر خۆشبون و تامەزرۆی دیدار بوون، خەڵک شانازی دەکا بەوەی

---

[١٨] رواه النسائي،٣٢٢٧.

کە هاوڕێیەتی لە گەڵ هاوسەرەکەیدا کردوە پێش کردنی بە خێزانی، ئەی بۆ ئەو هاوڕێیەتیە بەردەوام نەبێ لە دوای هاوسەرگیری.

## هەژدیەم:خۆچاککردن( مقصد إصلاح النفس)

لە بیرمان نەچێ لەناو ئێمەدا هێزێک هەیە پێی دەڵێن نەفس پێویستی بە ئارام کردن و پاکلرنەوەو بژارکردنە، زۆربەی هۆکارەکانی لێڵبوونی دەرون لەمڕۆدا ئارەزووبازیی و سەیرکردنی کەناڵ و سایتە بەدڕەوشتیەکانە، مرۆڤ ئەوکاتە کە هاوسەرگیری دەکا دەرونی خۆی ئارامدەکاو پێویستی بەم سەیرکردنانە نییە، هەرچەندە هیچ کات سەیرکردنی ئەم شتانە شەرعی و زانستیانە نییە بەڵام لە دوای هاوسەرگیری هیچ بیانو و پاساوێک نییە، بۆیە ئەوەی خێزانداره  بە دڵێکی ئارام نوێژو پەرستشەکانی دەکا، وە قەلەق و نائارام نییە بۆ داهاتووی، وە چاوەڕوانی کەسێک نییە لە دەرگای بدا بۆ هاوسەرگیری،

بۆیە زانایان فەرموویانە: (( پەرستشی کەسێک تەواو و کامڵ نابێ تا هاوسەرگیری نەکا، زۆرن ئەوانەی لە دوای هاوسەرگیری خۆیان دەدۆزنەوەو لە گوناهو تاوان دوور دەکەونەوە، ئەو کەسانەی هاوڕێی خراپیان هەیە خۆیان دوای هاوسەرگیری دەستبەرداری هاوڕێ خراپەکانیان دەبن متمانەیان پێ ناکەن، وە هاوسەر گیری مرۆڤ سەرقاڵ دەکا بە کاری پێویست و باشەوە، چونکە یەکێک لە هۆکارەکانی تاوانکردن دەستبەتاڵی و هاوڕێی خراپە، ئەمەش ڕاستەوخۆ مرۆڤ بەرەو پاکبونەوەو لە خوا نزیکبوونەوە دەبا،مرۆڤ کە هاوسەرگیری دەکات هەست بە بەرپرسیاریەتی دەکاو لە زۆر شت خۆی دەگرێتەوە.))

## نۆزدەیەم: ڕەخساندنی کاتی باش بۆ ژیانی بەختەوەرانە( مقصد إكتساب الوقت للحياة السعيدة)

لەوانەیە یەکێک بڵێ جا چۆن خێزانداری کات بۆ مرۆڤ دەگێڕێتەوە خۆ ئەرکی زیاتر دەبێ، دیارە ئەمە سەیر نییە، زۆر بەی ئەوانەی بێ هاوسەرن کاتیان  بە شتی باشەوە سەرف ناکەن، زۆربەی کاتیان مەحوی وتەنی ( لە ما لا يەعنيا سەرف دەکەن) زۆرن ئەوانەی کە دوای هاوسەرگیری مافی دایک و باوک، مافی خێزان، مافی منداڵەکان ، مافی هاوڕێکان دەدەن، بە وەش ڕادەگەن کە بژێوی ژیانیان دابین بکەن، زۆربەی ئەوانەی کە بە خوێندنی باڵاوە سەرقاڵن ئەوانەن کە خاوەنی هاوسەرن لە ژنان و لە پیاوان، بۆیە لە بەر ئەوەی هەستی بەرپرسیاریەتیان بەهێزە کاتەکانیان چڕدەکەنەوەو لە شتی باشدا سەرفی دەکەن و ئیدارەی باشی کاتەکانیان دەکەن، ئەوە بێجگە لەوەی هاوسەران خۆیان دەکەنە قوربانی جەوێکی هادیئو گونجاویش دەڕەخسێنن بۆ منداڵەکان کە کاتی تاقیکردنەوەو هاوسەرگیری دەکەن، بەڵگەیەکی ڕوون بۆ دروستبونی کاتی زۆر ئەو هەموو نوسین و دیراسەیەیە کە خاوەن هاوسەران دەیکەن.

## بیستەم: بەدیهێنانی ئامانجی دینداری( مقصد التدين)

یەکێک لە ئامانجە گشتی و سەرەکیەکانی ئیسلام پاراستنی دینی خەڵکە ئەمەش بە دوو شێوە: هەم بە ، بەدیهێنان، وە هەم پاراستن، باشترین هۆکارەکانی وەدیهینان بانگەشەو ڕوونکردنەوەو بڵاوکردنەوەی دینە، شێوازی دوەمیش پاراستنیەتی بە هەر ئامرازێکی شەرعی، لێرەدا بەشێکی باشی دینداری لە ڕێی هاوسەرگیری و مناڵ خستنەوەو پەروەردەکردنەوە بەدیدێ، کەواتە ئەمە لە خاڵەکانی پێشوتر جیاوازی هەیە، لەوێدا باسی دینداری تاکە کەسمان کرد وەک دوو هاوسەرەکان، بەڵام لێرەدا باسی دین دەکەین بە شێوە هەرە فراوانەکەی.

## بیست و یەک: ئامانجی پاراستنی ماڵی خەڵک( مقصد حفظ المال)

پاراستنی ماڵی خەڵک یەکی ترە لە ئامانجە گشتیەکانی ئیسلام، هاوسەرگیری هاندەرێکی باشە بۆ وەدەستخسنی ماڵ و سامان، ئەمەش پاڵنەرە بۆ دۆزینەوەی ڕێگای جۆراو جۆرو هەلی کار، ئەمەش دیسان پالنەرو هۆکارە بۆ وەدیهاتنی چەندین پرۆژەی گرنگ ،کە ئەوەش دەبێتە هۆکاری دەوڵەمەندبونی وڵات و تاکەکانی، پێشتریش باسمان کرد کە کەسی خێزاندار ناتوانێ دەستەو ئەژنۆ دابنیشێ و کار نەکات وەک ئەو کەسەی کە هیچ بەرپرسیاریەتیەکی ماڵ و خێزانی نەبێ، وە زۆر کار هەیە کە بە خێزان ئەنجام دەدرێ وەک ئاژەڵداری کشت و کاڵ، وە پێویستی بە کاری هەرەوەزییە، کارگەکانیش بە هەمان شێوە، وە زۆر مارکێتی گەورەش هەیە کە خێزان بەڕێوەی دەبا، لە سەدەکانی ڕابردودا کە ژیان وەک ئێستا ئاڵۆز نەبوبوو ژیان هەمووی هەرەوەزی و خێزانی بوو، چ کەسێک خێزان و دەستی کاری زیاتربا ئەوە لە هەموو کەس دەوڵەمەندتربوو، کەواتە لێرەدا گەیشتینە ئەو ئەنجامە کە هاوسەرگیری هۆکارێکی باشە بۆ وەدیهێنانی ماڵ و چۆنیەتی بە کاربردنی و جێ بەجێکردنی پێویستیەکانی ژیان.

## بیست و دوو: پاراستنی وەچە( مقصد حفظ النسل)

یەکێک لە ئامانجە گشتیەکانی ئیسلام پاراستنی وەچەیە( حفظ النسل) دیارە ڕێگای دروستبونی پەیدابوونی وەچە هاوسەرگیرییە، کەواتە هاوسەر گیری دەتوانێ دوو ئامانج بە دی بێنێ،یەکیان ئامانجی گشتی دووەمیان ئامانجی تایبەتی، بەڵام بەو شێوەیەی کە ئیسلام دەیەوێ وەچە دەپارێزرێ دەنا بەو شێوازەی کە سیستەمی جیهانی ئێستا دەیەوێ ئەو ئامانجە وەدی نایا، لەمڕۆدا ساڵانە بە چەندین ملیۆن مناڵ لە بار دەبردرێ، ئایا ئەو مناڵانە تاوانییان چییە؟.

بە ملیۆنان مناڵ لە برسان دەمرێ ساڵانە بە بەرچاوی دونیاوە، وە ملیۆنان مناڵ توشی بەدخۆراکی بووە لە سایەی سیستەمی جیهانی ئەمڕۆ کە هەیمەنەی بە سەر دونیادا کردوە، یەکێک لە گرفتە گەورەکانی دونیای ئەمرۆ ئەوەیە کە دەوڵەت دەبێ ملیۆنان مناڵی بێ باوک بە خێوبکا کە بەشێکیان لە شەقامەکان و بەردەمی کەنیسەکان و حاویەی خەستەخانەکان هەڵدەگیرێنەوە، دایکان بە هۆی دابینکردنی ژیانیان بێبەش دەکرێن لە بە خێوکردنی جگەر گۆشەکانیان کە ئەمەش ئامانجی پاراستنی وەچە بە شێوازێکی تر لە ناو دەبا

## بیست و سێ: ئاوەدانکردنەوەی زەوی( مقصد تعمير الارض)

بە پێی دەقی قورئان زەوی بۆمرۆڤ دروستکراوە وەک دەفەرموێ: هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (البقرة: ٢٩) واتە: هەر ئەوزاتە هەموو شتێکی لە زەویدا بۆ ئێوە دروست کردووە، پاشان ویستی ئاسمان دروست بکات، بۆیە بە حەوت چین بەدی هێناو ڕێکی خستن، هەر خۆیشی بە هەموو شتێک زاناو ئاگادارە.

بەڵکو ئاسمانەکان و زەوی بۆ مرۆڤ ڕامکراوەو دروستکراوە: وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (الجاثية: ١٣)

واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ ئێوەی ڕام هێناوە، بۆ خزمەتگوزاری ئێوە فەراهەمی هێناوە، هەمووشی تێکڕا بەخششن لەلایەن ئەو زاتەوە، بەڕاستی ئا لەو بەخشش و دیاردانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆرهەن بۆ کەسانێک کە بیربکەنەوە و تێفکرن.

ئاوەدان کردنەوەی زەوی بە مرۆڤ دەکرێ، زەوی وێرانبونی هەیەو ئاوەدانکردنەوەی هەیە هۆکارەکەی مرۆڤە ئایا ئاوەدانکردنەوە کاری ئەوکەسە

نییە کە خۆی لە دەرون و رەوشت و هزریدا حەزی لە ئاوەدانییە؟ وە هەوڵی بۆ دەدا؟ ئێستا زەوی بەدەستی کێیوە ژیان تێیدا وە تەنگ هاتوە مەگەر بە دەستی ئەوانە نییە کە بروایان بە بەهاو ڕەوشت نییە؟، مەگەر بەدەستی ئەوانە نییە کە ژیان بەس لە چوارچێوەی ماددەدا دەبینن و مادە پەرستن،؟

ئێستا سیستەمی جیهانی کە دونیا بەرەو تاریکی دەبا لە گەڵ هەبونی ئەم هەموو پێداویستیانەی ژیان بەرەو هەڵوەشاندنەوەی خێزان دەچێ، وە دژایەتی خێزان دەکا، وە برەو بە لادانی جنسی دەدا ئەمە لە بەر ئەوەیە هاوسەرگیری لەو ئامانجە گوڵاوانە ڕێگرە، بۆیە هاوسەرگیری ئاوەدان کردنەوەی زەوییە بەلایەنی: ئیمانی، ئەخلاقی، پاراستنی خێزان، پاراستنی مناڵ، ڕێگری لە نەخۆشی، ڕێگری لە فەوزای جنسی...هتد

## بیست و چوار: پاراستنی کۆمەڵگا لە نەخۆشیە لە ناو بەرەکان( حفظ المجتمع من الامراض الفتاكة)

یەکێک لە ئامانجە پیرۆزەکانی هاوسەرگیری پاراستنی خێزانە لە نەخۆشیە ترسناکەکان کە درمن(معدی)ن بە ئاسانی لە ڕێی جنسەوە دەگوازرێنەوە، ئەمەش وتەی تەندروستی لەوبارەوە کە دکتۆر محمد علي البار لە کتابێکدا بە ناوی ( الامراض الجنسية) لە زیاتر لە ٤٠٠ لاپەردا باسی مەترسیەکانی نەخۆشە سێکسیەکانی کردوە بە هەموو جۆرەکانەوە نەخۆشییە سێکسیەکان

نەخۆشیە سێکسیەکان ئەو نەخۆشیانەن کە بەشێوەیەکی سەرەکی لە ڕێگەی پەیوەندی سێکسیەوە تووشی ئینسانەکان دەبن. هۆکارەکانیشیان:

کۆمەڵێک بەکتریاو ڤایرۆس و زیندەوەرەسەرەتاییەکانن( protozoa ) ، ئەونەخۆشیانەش بریتین لە:کلامودیا(Chlamydia) ، کۆندولۆمە (condyloma).

ئاگرەی ئەندامی زاوزێ:

جێنیتاڵ هێرپس(genital herpes) ، سفلس(syphilis) ، گۆنۆریا (gonorrhea)، مایکۆپلازمە جێنیتاڵ( Genital Mycoplasma) ، توشبونی HIV (Human immunodeficiency virus ) کە ئەبێتە هۆی ئایدز (AIDS)، هەندێک جارهەوکردنی جگەر جۆری. (hepatitis)

## چۆن نەخۆشیە سێکسیەکان دەگوێزرێنەوە:

١) لە ڕێگەی خوێنەوە: لەکاتێکدا برینداری ڕوپۆشی ئەندامی مێینە یان بریناری پێستی ئەندامی نێرینە کە بەریەک دەکەون.

٢) هەروەها گواستنەوەی نەخۆشیەکە لە ڕێگەی چۆنیەتی سێکسەکەوە لە ڕەحمەوە یان کۆمەوە یان دەمەوە (کە ڕوپۆشی دەم زۆربەی کات بریناری تیایە)، گرنگە بزانین برینارییەکە بە چاو نابینرێت، خانەیەک بۆ چەند خانەیەک بریناربێت نەخۆشیەکە دەگوێزرێتەوە کە هەرگیز بە چاو نابینرێن.

٣) لەڕێگەی بەکارهێنانی کحول و مادەهۆشبەرەکانەوە مەترسی توشبون زۆر بەم نەخۆشیە زۆرە.

٤) نەخۆشیەکە ناگوێزرێتەوە لەڕێگەی: ئاوی مەلەکردنەوە، تەختەی حەمامی بوخارەوە (ساونا)، قەراغی ئاودەستەوە کەلەسەری دادانیشین، ئاودەستی غەربی، باوەشکردن، ماچکردن، دەست لێدان.

هەر چەند ئەوە بۆ من جێگای گومانە، چونکە بەشێک لە دکتۆرەکانی دی بۆچونیان وانییە نالێن لەم ڕێگایانە ناگوازرێنەوە.[١٩]

## خۆپاراستن:

[١٩] ـ ئەمە بۆچونی خۆمە دەربارەی ئەوەی کە دەڵێ: لەم ڕێگایانە ناگوازرێتەوە، چونکە هۆشداری تەندروستی بە چڕی دەربارەی خاوێنی ئەم شتانە پێچەوانەیە لەگەڵ ئەم بۆ چوونە.

١) دووركەوتنەوە لە فرە سێكسی، واتا دوركەوتنەوە لە سێكسكردن لەگەڵ كەسانی دیكە.
٢) بەكارهێنانی كۆندۆم هی پیاوان یان ژنان ، لەكاتی سێكس كردندا زۆرگرنگە.
٣) خاڵێک كە زۆرگرنگە، هەرگیز ڕووی دەرەوەی ئینسانەكە شەرت نیە بۆ زانینی ئەوەی كەسەكە توش بووە و هەڵگری میكرۆبەكەیە، ڕەنگە كەسەكە زۆر سپۆرت و پاكوتەمیزو بۆن خۆش بێت، هەرگیز نابێت متمانە بكرێت بە ڕوالەت، بە بێ بەڵگەی زانستی پزیشكی. بۆ نمونە ئەگەر كەسەكە توش بوبیت لەوانەیە پاش ماوەیەكی دوورودرێژ نیشانەكانی (HIV) واتا قۆناغی پێش ئایدز دەربكەوێت.

پاشان ئەگەر كەسەكە تووش بووبێت پاش ٣ مانگ دوای توشبون ئەوسا لە فەحسی موختەبەردا دەردەكەێت! تكایە با وریابین. لێرە كەسانی هۆشیار، بۆ نمونە كە دووكەس ئەیانەوێت پێكەوە بژین لانی كەم پاش ٣ مانگ هەر یەكەیان هەموفەحسە جنسیەكان دەكەن ئەوسا پێكەوە ئەژین یان زەواج ئەكەن. نیشانەكان و پشكنینی موختەبەری و چارەسەر : هەموو نیشانەكانی نەخۆشی سێكسی لەسەرەتادا بێ نیشانەن، ئەگەر بچوكترین گومان دروست بێت ئەبیت فەحس بكەیت. نیشانەكانی هەر نەخۆشیەكی سێكسی جیاوازە.

## نیشانەكان بەگشتی بریتین:

١) كزانەوە لەكاتی میزكردن یان زەحمەتی میزكردن.
٢) ئازاری خوارویی سک... هتد. وەک نیشانەكانی هەوكردنی بۆری میزومیزەڵدان ئەمە گومانی (كلامودیایە) كە هۆكارەكەی بەكتریایەو چارەسەری هەیە، گەر چارەسەر نەكرێت لەداهاتودا ڕەنگە تووشی نەزۆكی ببێت.

## هەروەها نیشانەی نەخۆشیەکانی دیکە:

نەزیفی شلەیەکی خەست لە ڕەحمەوە یان زەکەرەوە، لەگەڵ خوران و کزانەوە، یان بلّق وزیپکە یان بریناری لەئەندامی زاوزێ وئازاری خواروی سک ، دەبێت بجیتە لای دکتۆر بەپێی نیشانەکان فەحسی موختەبەر دەری دەخات کام نەخۆشیە؟

نەخۆشیەکانی بەهۆی بەکتریاوە بێت چارەسەری هەیە، بەڵام ڤایرۆسیەکان چارەسەری زەحمەتە یان هەر نیە.

نیشانەکانی نەخۆشی (HIV infections) قۆناغی سەرەتای : (AIDS) سەرەتای نەخۆشیەکە نیشانەکانی ٢ بۆ ٦ هەفتە دەردەکەوێت ( لە دووکەسدا کەسێک یان لە ٣ کەسدا کەسێک) دەرئەکەوێت، ئەمانەیە:

( تا، هەوکردنی جومگەکان، بریناری بە ئازاری ناوو دەم، سەرێشەی بەردەوام، لیمفەگرێکان ئەستوردەبن، بلّق هاتن لە دەوروبەرسەر، بەشی سەرەوەی لەش لەگەڵ دەست و بەری پێ، ئازاری جومگە وسکچوون.... هتد.)

نیشانەکان لە هەمو کەسێکدا وەک یەک نین. نیشانەکان پاش مانگێک نامێنێ لە قۆناغی (HIV) ی سەرەتادا، پاشان بۆ چەند ساڵێک قۆناغی بێ نیشانەیە. بۆ فەحسی نەخۆشی (HIV) لەخوێنەوە وەردەگیرێت بۆپشکنینی دژە تەنی (HIV) واتا (HIV-AgAb) ٢ بۆ ٤ هەفتە پاش دەرکەوتنی نیشانەکانی تا تێپەڕبوونی ٣ مانگ[٢٠].

[٢٠] بڕوانە:https: www.hare news.com/details/١٩٣٠٦، ٨/ ٦ /٢٠٢١

## بیست و پێنج: خۆپاراستن لە دارمانی خێزانی و ڕەوشتی( مقصد حفظ الاسرة من الانحطاط الاخلاقی)

دیارە ئامانجی شەریعەت هێشتنەوەی تاک، خێزان، کۆمەڵگا، ژیان، ژینگە، بە تەندروستی و خاوێنییە. هەرکاتێک تاک یان خێزان دارِما ئەوە کۆمەڵگا دادەڕمێ، ئەگەر کۆمەڵگا دارِما ژیان نامێنێ بە شێوەیەک کە پێی بوترێ ژیانی شەرەفمەندانەو سەربەرزانە، بۆیە ئەم شەریعەتە هەموو ڕێگا چارەسەرێکی داناوە بۆ ئەوەی خێزان جوان بمێنێتەوە، وە بەرپرسیاریەتی دەخاتە سەرشانی هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا، بە تایبەت دایک و باوک، لە سەروی ئەوانەوە سیستەمی بە ڕێوەبردنی وڵات، سیستەمی پەروەردە، وە ڕێگە گرتن لە بڵاو بونەوەی مادده هۆشبەرو سڕکەرو کحولیەکان، وە سانسۆردانان لە سەر ئەو فلمانەی کە کاریگەری نەرێنییان هەیە بۆ سەر هاوڵاتی بە گشتی و خێزان و منداڵ بە تایبەتی،ئێستا ئەوەی عاقڵمەندانی ئەوروپا بۆی دەگرین نەمانی خێزانە، پشتکردنە لەهاوسەرگیری، وە کۆتایی پێهاتنی ژیانی خێزانییە ئەگەر ڕێژەی هاوسەرگیری لە ١/١٠٠ بێ ئەوە ڕێژەی جیابونەوە زۆر لەوە زیاترە. لە ئەوروپاو و کۆمەڵگە هەڵوەشاوەکان خەڵک ناچێتە ژێر باری بەرێوەبردنی بەرپرسیاریەتی خێزانی، ژیان تەنیا لە ڕابواردنا دەبینێتەوە ئەوەش لە گەڵ یەکێک بەکاتی جێبەجێدەکا، هەتا ئێستا ئەوەی کە لای ئێمە تا ئەندازەیەک بە باشی ماوەتەوە خێزان و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و نەبونی ئەو نەخۆشیە ترسناکانەن کە هەڕەشە لە ژیانی مرۆڤایەتی دەکەن کە لە ڕێی فەوزای سێکسیەوە بڵادەبنەوە.

## بیست و شەش: ئامانجی پاراستنی کۆمەڵگا لە مادە هۆشبەرو سڕکەرو کحولیەکان(مقصد حفظ المجتمع من المواد المخدرة والكحولية)

پاراستنی ژیری و تەندروستی مرۆڤ یەکێکە لە ئامانجە سەرەکیەکانی کۆمەڵگا، وە هەروەها ئەو ماڵ و سامانەش کە لەو بوارەدا سەرف دەکرێ، چ بۆ بڵاو بوونەوەی ئەم مادە زیانبەخشانە بێ، وە چ بۆ ڕێگری لێکردنی، وە چ بۆ چارەسەربوونی توشبوان بەو دەردو بەڵا گەورە، لە زەقترین و دیارترین هۆکارەکان توش بوون بەو مادانە پەرتەوازە بوونی خێزانە، مناڵ کە شوێنێکی ئارامی نەبوو تێیدا بحەوێتەوە پەنا بۆ ئەو شتانە دەبا، کوڕو کچ کە لە چوارچێوەی خێزاندا نەبوون بە زووی دەکەونە داوی ئەوانەی کە بازرگانی بەم مادانەوە دەکەن.

پێم باشبوو ئەم ڕاپۆرتە نەقڵ بکەم کە بە گشتی لەسەر ئاڵودەبوون بە مادە هۆشبەرەکان نوسراوەو زیانەکان و چارەسەرەکانیشی تێدا باسکراوە وا دەزانم زۆر سوودی دەبێ ان شاء الله:

### یەکەم: پێناسەی ئالوودەبون:

ئەوەیە کە هەرکەسێک خوو بەهەرشتێک بگرێت بەرێژەیەکی زۆر و نەتوانێت وازی لێ بێنێ مانای ئالوودەبوونە. خووگرتن یا ئالوودە بوون جۆریان زۆرە لە وانە ئالوودە بوون بە مادده هۆشبەرەکان، جگەرە، کحول، یاری (قوومار، یاری کۆمپیوتر) هەروەها لە سەردەمی ئێستاماندا ئالوودەبوونی ئێنترنێتیشمان هەیە واتە بەکارهێنانی ئینترنێت بەرێژەیەکی زۆر و ماوەی درێژ. لەکۆمەلگای ئێمەدا ئاڵوودە بوون بە جگەرە زۆر باوە ، بەداخەوە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکانیش روی لەزیادبوون دایە. ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە کە بەکارهێنانی هەر یەک لەجگەرە و کەحول و مادده هۆشبەرەکان کاریگەری خراپی لەسەر باری تەندروستی کۆمەڵایەتی و

ئابووری ئاشکرایە، سەرەڕای ئەوەش دیاردەی بەکارهێنانیان روو لەزیادبوون دایە.

## دووەم: هۆکارەکانی ئالوودەبوون:

- باوەڕ بەخۆنەبوون.
- هاوڕێی خراپ.
- خراپی باری کۆمەڵایەتی.
- باری ئابووری خراپ کەم دەرامەتی یا بەپێچەوانەوە.
- کەمی یا خود خراپی پەروەرد.ەی خێزان.
- کەمی ئاستی زانیاری
- بێ کاری و بی پیلان.
- نەخۆشی دەروونی.
- خۆشاردنەوە یاخود ڕاکردن لەچارەسەر کردنی کۆسپ و تەنگ و چەڵەمە.
- بەکارهێنانی توندوتیژی لەکاتی پەروەردە کردن یەکێکە لەهۆکارە سەرەکیەکان.

## سێیەم: چارەسەرکردنی ئالوودەبون:]

بەگشتی و ئالوودەبون بە مادده هۆشبەرەکان بەتایبەتی زۆر سەختە،کاتی زۆری دەوێت هەروەها زۆری تێ دەچێت, کێشەیەکی گەورەیە بۆ کۆمەڵگا و دەوڵەت لەبەرئەوەی کۆمەڵگا لە جیاتی بایەخ و پەرەپێدانی بواری تەندروستی، خوێندن، پیشەسازی، ژینگە و بەرفراوانترکردنی کاروبار و چالاکیی لاوان و گرنگی دان بەژیان و گوزەرانی منداڵ و خێزان ناچارە

مەسرەف بکات لەچارەسەرکردنی دیاردەی ئاڵوودەبون بەکردنەوەی بەندیخانەو شوێنی تایبەت بۆ چارەسەرکردن ئەمەش بێ گومان دەبێتە ئەرکێکی گەورە لەسەر کۆمەلگا لەبەر ئەوەباشترین چارەسەر ئەوەیە تاک بەهەموو شێوەیەک خۆی دوور راگرێت لەم دیاردە نابەجێیە،بەپێی توانا هەوڵی ئەوەبدرێت باس لەزیانەکانی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان بکرێت لەناوو کۆمەڵگا بە تایبەتی لەناو گەنجەکان بەشێوەیەکی ئاشکرا.

## مۆرفین:

جۆرەکانی ماددەی هۆشبەر تریاک لەراستی دا شیرەی گوڵی خەشخاشەکە پاش بریندار کردنی،شیرەیەک لەتۆپی گوڵەکە دێتەدەر و پاش ویشک بوونەوەی لە هەوادا دەبێتەشیرەی تریاک. چاندن و بەکار هێنانی تریاک دەگەرێتەوە بۆ ٣٤٠٠ ساڵ بەر لەئێستا. لەزەمانی دەستەڵاتداریەتی سۆمریەکان لە مێزۆپۆتامیا بە گیای لەزەت یان خۆشی ناسراوە، بەکارهێنان و چاندنی ئەم گیایەلەناو ئاشوریەکان و میسریە کۆنەکان و ئێرانیەکان دا هەر لە رۆژگارانی بەرێ بۆ مەسرەفی دژە ژان و سر کردن لای حەکیمەکان نرخی تایبەتی هەبوە.بەشێوەی سروشتی لەناو تریاک دا ١٠% مۆرفین بەدەست دێت کەنەوعێک ئالکالۆ ئیدە و بەهۆی ئاڵو گۆری کیمیای لە مۆرفین مادەیەکی تر بەناوی هێرۆئین بەدەست دێت. مەسرەف و بەکار ەینانی تریاک هەتا شەری ناوخۆیی ئەمریکا لە١٨٦١تا١٨٦٥ هەر بە شێوەی سەرەتایی خۆیی بوە کە لە کاتەدا پاش دروست کردنی و لێ هەڵچۆڕاندنی مۆرفین و بەکار هێنانی بەشیوەی ئامپول و تەزریق کردنی لە سەر لەشی بریندارەکانی شەر بۆ ئەنجامی عەمەڵیاتی جەرراحی و ئارام کردنەوەی ژان، شێوەی مەسرە ف و بەکار هێنانی ئاڵو گۆری بەسەردا هاتووە.ئێستاشی لەگەڵ بێت مۆرفین بەربلاوترین دەرمانی ئارام بەخشە کە لە گەڵ نەخۆشخانەکان و مەیدانەکانی شەر و لەکاتی رووداني پێشهاتەکاندا بۆ بریندااران و نەخۆشەکان بەکار

دێت.لەکۆندا مەسرەفی تریاک بۆ کەڵکی خۆشگوزەرانی لەسەدەی ١٥ و لەوڵاتی چین دەستی پێ کرد، لەسەرەتادا بەهۆی گرانی و کەم بونی زۆر باو نەبوو پاشان لەسەدەی ١٧ زاینیدا تجارەتی تریاک چووە قاڵبەکی دارێژراو تر و پەرەی پێدرا.

مۆرفین بەشێوەی تەبیعی لەناو تریاک دا هەیەکەنزیکەی ١٠ % پێک دەهێنێت و پاش هەڵێنجانی لەتریاک بەشێوەی دەرزی ( ئامپول) دەنێردرێتە لەش ، لەکاری پزیشکیدا بەشێوەیکی زۆر بەر بڵاو بەکار دێت، کارایی و تەئسیری مۆرفین دەگەرێتەوە سەر ئەندازەی خاوێنیەکەی.لەپاش ١ دەقە کە لە رێگای رەگ واتا خوێن کەدەچێتە ناو لەش کار تێکرنی بەدیار دەکەوێت.بەڵام لای موعتادەکان بەگشتی لەچەشنی حەب مەسرەف دەکریت.وشەی مۆرفین لەناوی خواوەندی یۆنان بەناوی مەرفێئوس واتا خوای خەیال و رۆئیا وەرگراوە.لە جوملەی مەوادە خەتەر ناکەکانە و قوتار بونی کابرای قوربانی زۆر زەحمەتە.

## هیرۆئین:

هێرۆئین لەوشەی هێرۆ یان هێرۆس واتا پیاوی قارەمان وەرگیراوە( هێرۆئین) بەهۆی ئەو ئاڵ وگۆرە کیمیایە کە لە سەر مۆرفین دەکرێت بەدەست دێت و پێدەچێت کە دواین پلەی ئیعتیاد بێت.لە سالی ١٨٧٤ لەلایان زانایەکی بریتانیایی دروست کرا و ١٨٩٠ بەهۆی کەسێکی ئاڵمانی پەرەی پێدرا و ساڵی ١٩٥٥ لەئێراندا لەلایان کەسێک بەناوی دکتۆر مستەفەوی شێوەی بەدەست هاتنی لە لابراتوار دا بۆ چەند کەس نیشان درا و بەم جۆرە لە وڵاتدا بڵاو بۆوە. بە شێوەی هەڵمژین و دەرزی واتا تەزریق بەکار دێت.کەسانێک کە شێوەی ئامپول بە کاری دێنن لەرەگی پاش و پێشی باسک (قۆل) یان دەست پێدەکەن کەئەم کارە پشتی مانگێک وا لەرەگەکان دەکات کە ئیتر توانای وەرگرتنی دەرزیان نا بێت ، هەر بۆیە موعتادەکان مەجبورن بۆ تەزریق لەرەگی

مل (گەردەن)یان کەڵک وەرگرن ئینجا وایان لێدێت کە لەدەزگای تەناسوولی یان تەزریق بکرێ واتە لە دەمارێکی ژێر گونەکان!.

عەوارز و کارتێکرنەکانی هێرۆئین بریتین:

ـ مێشک داماو و زەلیل دەکات بەجۆرەک کە مرۆڤ بێ هەڵوێست دەکات لە ئاست هەر شتێک..

ـ کەسایەتی مرۆڤ دادەروخێنێت و بێ دەستەڵاتی دەکات.

ـ بێخەوی لەکاتی شەو و خەواڵویی لەکاتی رۆژ.

ـ ئاوسانی مێشک.

ـ چاکردنی لوو واتا ئابسەی مێشک.

ـ تێکدانی کاری گەدە(معدة) و بێ مەیلی بۆ خۆراک و دابەزینی کێشی مرۆڤ و هتد.

ـ لەدوای چەند کاتژمێر پاش دوا دەرزی نزیک ٢٠ ساعەت، لایەنی موعتاد توشی بەیەکدا هاتنی ریخۆڵەو گەدە دەبێ بەجۆرێک کەمرۆڤ توشی سکچون و ڕشانەوە دەکات.

ـ لووت بێ وەستان ئاوەچۆرە دەگریت و باوێشکی بڵند و بەردەوام.

ـ پاشی ٣٦ ساعەت لەرزی بێ وینەو ئارەق کردن بەجۆرێک کەهەمو گیانی موعتاد تەڕی ئارەق دەبێت.

ـ ژانێکی بێ هاوتا و ترسناک و پاشان بێ هێزییێکی تەواو بەچەشنێک کەناتوانێت سەری بەرز کاتەوە و هەمویان لەئاسەوار و کار تێکرنەکانی ئەم بەڵا ماڵ کاولکەرەیە.

## کۆکائین:

کۆکائین لەگەڵای درێک بەناوی (کۆکا) بەر دەست دێت کە ناوەندی سەرەکی چاندن و بەرهەم هینانی ئەم گیایە باشووری کیشوەری ئەمریکایە (ئەمریکای لاتین). بەچەشنی گەردێکی نەرمی سپی رەنگ دێتە بەر چاو بو بە جۆرەکانی کێشان، دەرزی ، هەڵمژین و زۆرجار دەیپرژێنەسەر نخعەندامی هەناسە.لەکۆندا لەلای هیندیەکان ، ولآتی پێرۆ و بوولیڤی گەڵای روەکی کۆکا بەکار هاتوە و بەشکڵی جاوین بەکاریان هێندراوە بۆ وەر گرتنی وزەی زیاتر لە لەش و دەوامی زیاتر لەبەرامبەر ماندوو بون و برسیەتی دا.کۆکائین بە شێوەی ئێستا لەسالی ١٨٦٠ دا هاتە بازاری بەکارهێنان . لەناو موعتادەکاندا بەناوەکانی کۆکا، کەندی. سنۆ (بەفر)، هەپی (خۆشی) و هتد... بەناو بانگە و لە موخەدیراتە ترسناکەکانە

## کراک:

کراک هەتا ئێستا لەم ماددیە بێ بەزەییتر نەهاتۆتەوە ناو کۆمەڵگاوە. بەجۆریک کەتەنیا جاریک چوون بەدوای کراک دا مرۆڤ بۆ هەمیشە ماڵوێران بکات!!. کراک عوسارە واتا پاڵاوتەی کۆکائینەو بەشێوەی هەڵمژین لەرێگای لووت یان کردن بەدووکەڵ و لە ماریجوانا ، یان لەرێگای پیپ تەدخین دەکرێت دەبێتەهۆی گەورەبونی دڵ و پاڵەپەستۆ ( فشاری خوین ) دەباتەسەر حاڵەتەکی هێرشکارانە دەداتە مرۆڤ و وابەستەگی رەوانی زۆر قورس لەسەر موعتاد دادەنێت و زیپکەو برین لەسەر پێست دروست دەکات و مرۆڤ تووشی واهیمە دەکات بەجۆرەک کە زەمان و مەکانی بۆ نا دیاردەبێت.

## حەشیش:

حەشیش لەگیای کانابیس بەدەست دێت و بەشکڵی ڕەنگ قاوەیی کەم ڕەنگ بەشکلی قالب دێتەبەر چاو لەگەڵ توتن یان ماری جوانا وەک سیگار دەکشرێت و بەناوەکانی هاش، گراس، پۆت و سمۆک لای موعتادەکان ناسراوە.لەسیەکان ، هاتنەخواری هێزی بەرگری لەش بێ مەسئولیەتی وناو گەنجان دا زۆر باوە. سەرەتانی لەدەستدانی هێزی ڕانەندەگی و تەوەهووم زایی و... لەئاساری مەسرەفی حەشیشن هەر وەها ڕۆنی حەشیش... لەحەشیش بەدەست دێت و توتنی پێ چەور دەکەن وو تەدخین دەکرێت. ئەسەراتی زۆر خراپی لەژنانی دووگیان هەیە بە تایبەت لەسەر منداڵان بە جۆریک پاش لەدایک بوون لەباری ڕەوانیەوە زۆر موشکیلەیان هەیە. بێجگە لەمانە کە زۆر ناسراون و بەر بڵاو مەسرەف دەکرین مەوادی دیکە وەک:

## مارجوانا:

مارجوانا ئێڵ ئێس دی ئامفتامین تی ئێچ سی لەحەشیش بەدەست دێت. هەروەها لەدونیا بێ ڕەحمی تەجارەتی موخەدیرات دا بەدەیان چەشنی تر لەمادەسر کەرەکان دەدرێنەدەست گەنجان و کۆمەڵگای مرۆڤایەتیان پێ گەندەڵ دەکرێن.تەنیا لەئێران بەپێی ئامارەنێو نەتەوەیەکان زیاتر لەە میلیون موعتاد هەیە! کە بۆتە هۆی سەر چاوەی ئەسڵی فەحشا و دارمانی بەها کۆمەلایتیەکان و بێ ڕەحمی کۆمەڵگا لە ئاست مرۆڤەکان.بەڵای ئعتیاد لە تێکدەرترین و سامانک ترین هۆکارەکانی دارمانی بناغەکانی ئەسڵی هەر کۆمەڵگایەکن کە ئەسرات و کار تێ کردنەکانی لە بووارەکانی ئابوری و جڤاکی و دەروونی بۆ زەمەنەکی دوور و درێژ هەر بەر چاو دەبن.

## چۆن کەسی تووشبوو بەمادده هۆشبەرەکان بناسینەوە؟

کاتێک ئەندامێکی خێزان دووچاری بەکارهێنان و ئالوودەبوون دەبێت بەمادە هۆشبەرەکان، زۆر گرنگە خێزان زانیاری هەبێت دەربارەی ئەو نیشانانەی

لەکەسی تووشبوودا دەردەکەوێت تاکو بەدەم چارەسەرەوە برۆن و کۆتایی بەژانکۆی خۆیان و ئەندامەکەیان بێنن. بۆ ئەوەی خێزان سەرنج بداتە ئەو گۆرانکارییانەی لەرەفتار و کەسێتی هەر ئەندامێکی بەکارهێنر (Abuser) یان ئالوودەبوو (Addict) بەمادەهۆشبەرەکان پێویستە بەو نیشانانە ئاشنابن کەکەسی تووشبووی پێدەناسرێتەوە. ئەگەر هەشت (٨) لەم نیشانانەی خوارەوە ئاماژەیان پێدراوە بوونی هەبوو لە هەر تاکێکدا، دەکرێت یارمەتی خێزان بدات لەناسینەوەی ئەم حاڵەتە لە کاتێکدا خێزان لەباری گوماندا بێت بەرامبەری. گرنگترین ئەو نیشانانەش:

١ -تەسکبوونەوەی بیلبیلەی چاو.

٢ -لێڵ بوونی رەنگی دەم و پێست و ژێر نینۆک و لێوەکان بەتایبەتی، ئەمەش بەهۆی رانەگرتنی باری تەندروستی و بەد خۆراکییەوە

٣. -کەسی تووشبوو ئاو لەلوتی دەتکێ و پژمین و باوێشکدانی نائاسایی و زۆری هەیە.

٤ -بەبێ هۆکار ئاسایی وەنەوز دەدا و شێوەی برۆ و برژانگی تێک دەچێت.

٥ -گن بوونی دەنگ و کۆکینی زۆر و بەتایبەت لەبەرەبەیانیاندا.

٦ -ددانی تووشبوو رەشایی و کلس و نەخۆشی لەرادەبەدەری لەسەر دەردەکەوێت.

٧ -فەرامۆشکردنی ڕواڵەت وەک: گرنگی نەدان بەجل و بەرگ و پاکوخاوێنی.

٨ -دەرکەوتنی خاڵی رەش و شین و شوێنەواری سووتان و دەرزی لەسەر قۆڵ و مەچەک و هەندێجار ناو پەنجەی پێ.

٩ -لاواز بوونی ئارەزوو و توانای سێکسی بەتایبەت لەپیاواندا.

١٠ -کێشەی بەردەوامی هەرسی خۆراک و ئازار و ژانی گەدەو قەبز بوون.

١١ -زۆر خورانی لەش و جەستە، زۆرتر لوت و قاچ و سک و لای روومەت.

١٢ -زۆر جار قەترەی چاویان پێیە بۆ کەمکردنەوەی سوری چاو (بەتایبەت لای ئالوودەبووانی حەشیش). ١٣- تووشبووی مادە هۆشبەرەکان خێرا زیز و توورە دەبێت و دەتۆرێ، رەفتار و قسەی کتوپر و بێسەروبەر دەکات.

١٤ -بەشێوەیەکی نائاسایی لەرادەی چالاکی خۆی کەم دەکاتەوەو لەئەرک و ئیشی جەستەیی خۆی دوور دەخاتەوە.

١٥ -رۆژانە هەندێکی زۆر پارەی دەوێت، زۆربەی کات بێپارەیەو خەریکی قەرز کردنە.

١٦ -لەگەڵ کەسانی گومان لێکراودا هاتوچۆ دەکات و پەیوەندی هەیە( ئەوانەی ناوبانگی خراپیان هەیە)، کەم قسەدەکات دەربارەی هاورێ نوێیەکانی، ئێواران درەنگ دێتەوەماڵ.

١٧ -تووشی شکست و بێتوانایی دەبێت لە پێراگەیشتن بەکاتەکانی دەوام کردنیدا.

١٨ -لەژووری خۆی یان پێشاو و حەمام یان لەشوێنەچۆڵەکاندا زۆر دەمێنێتەوەو پێی ناخۆشەچۆڵگەی لێتێک بدرێت.

١٩ -بەهۆی ئەو هۆیانەی لەخاڵەکانی رابردوودا ئاماژەی پێکرا، درۆ و پەیمان شکێنی زۆر دەکات.

٢٠ -ئیشی شاردراوەو گوماناوی هەیەو جانتای پارەو شقارتەو پاکەتی جگەرە دەشارێتەوەو گیرفانی لەماڵەوە دەپارێزێت، کاتێک کە لە ماڵەوە نەبێت ئەگەر ژۆری خۆی هەبێت دەرگاکەی کلیل دەدات.

٢١ -حەزی لەرادەبەدەری لەچای خەست و قورس هەیە(دەکرێت تلیاکیشی تێدا بەکار بەێنێت).

٢٢ -حەزی لەخواردنی ترشیات نییە و ئارەزووی زۆری لەخواردنی شتی شیرینە.

٢٣ -ئالوودەبووی مادەکان لەناکاو یان لەکاتی نەخۆشیدا لەپشکنینی میز یان خوێن زۆر نیگەران دەبێت و هەوڵ دەدات دوای بخا یان هەر نەیکا، لەترسی ئاشکرابوونی حاڵەتەکەی.

٢٤ -نەرۆیشتن بۆ سەفەر و سەردانی دوورە رێ و لەئیفادی فەرمانگە خۆی دەدزێتەوە چونکە نیگەرانی دەست نەکەوتنی مادەی هۆشبەرە.

٢٥ -کەمبوونەوەی کراوەیی و متمانە بەخۆبوون و کۆششەکانی.

٢٦ -حەب و شروبی کۆدائیندار و حەبی خەوهێنەری وەک دیازپام (ڤالیۆم) و حەبی زۆر بەهێزی دژی سکچوون (دیفنۆکسیلات) پاشکەوت دەکات و بەکاریان دەهێنێت.

٢٧ -لەسەر جانتا و کەلوپەل و جلوبەرگیدا شوێنەواری سووتاوی بڵاوبوونەوەی ماددەهۆشبەرەکان و کاریگەریان لەسەر کۆمەڵگا.

## ئەلکحول:

نیشانەکانی ئالوودەبوون بەمەی (ئەلکحول) بۆ ناسینەوەو دەستنیشانکردنی مرۆڤێک کەتووشی ئالوودەبوون بەمەی خواردنەوە بوو بێت ، ئەو مرۆڤەپێویستە بەدرێژایی ساڵێک سێ لەم شەش نیشانانەی خوارەوەی تێدابێت:

١ -هەمیشەخولیایی خواردنەوەی هەبێت

٢- نەتوانێت مەی خواردنەوە بوەستێنێت یا نەتوانێت کەمی بکاتەوە.

٣ -پاش چەند سەعاتێک لەئەنجامی کەمکردنەوەیا وەستاندنی خواردنەوەی مەی تووشی دیاردەی کشانەوەی ئەلحەول ببێت .دەست پێ بکات واتەبۆ ئەوەی مەی ەەمان کاریگەرییToleranceـ.

٤ -کاتێک نیشانەی تۆڵێرانس پێشو تری هەبێت مەیخۆر بە بەردەوامی بریی بۆ مەی زیاد بکات.

٥ -بەبێ ئەوەی بایەخ بە زیانەکانی ئەلکحەول بدات هەمیشە مەیخۆر بەبەردەوامی ئەلکحەول بخواتەوە.

٦ -هەمیشە مەیخۆر لەچالاکییدا دەبێت و بۆ ئەوەی ماددەی ئەلکحەولی دەست بکەوێت کاتێکی زۆر بەسەر دەبات.

فیزیۆلۆجی ئەلکحول ئەلکحول کاردەکاتەسەر گشت ئەندام و کۆئەندامی لەش: کاتێک بەبرێکی زۆر مرۆڤ مەی بخواتەوە ئەلکحول کاردەکاتەسەر هەموو ئەندام و کۆئەندامەکانی لەش و دەبێتەهۆی لەهۆشخۆچوون و گیان لەدەستدان . ئەلکحول کاردەکاتە سەر مادەگواستراوەکانی دەمارەکانی ناو مێشک لەنێوانیاندا : ئۆپییەیتەکان ،گابا،گلوتامەیت ،سیرۆتۆنین و دۆپامین . پاش خواردنەوەی ئەلکحول بەرزبوونەوە و زیادبوونی رێژەی ئۆپییەیت مرۆڤ سەرخۆش و دڵخۆش دەکات ، لەهەمان کاتدا کاردەکاتەسەر گابا و دەبێتەهۆی ئارامبوونی مرۆڤ بۆیە ئەو مرۆڤەی شڵەژاندنی دەروونی هەبێت (دڵەراوکێ، خەمۆکی، مانیا، شکیزۆفرینیا...هتد) پەنا دەباتە بەر مەی خواردنەوە و لەوانەیەتووشی ئالوودەبوون (ئیدمان)ی ئەلکەولیی ببێت. کاتێک مرۆڤ بۆ ماوەیەکی درێژ لەسەر مەی خواردنەوە بەردەوام بێت مەی خواردنەوە دەبێتە هۆی مردن و لەناوچوونی خانەی مێشک و مێشکۆلە لەرزین. ئەو لێکۆڵینەوە زانستیەی کەبۆ نەخۆشەکانی ئیدمانی ئەلکحولی

کراوە دەریخستووە کەرێژەی ئۆپییەت زیاد دەکات بۆیە مەیخۆر تووشی دیاردەی خولیای مەی خواردنەوە دەبێت.

## ئەلکحول دەبێتە هۆی نەخۆشیی و گیان لەدەستدان:

پاش قەڵەویی و جگەرەکێشان لەوڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا بەسێیەم هۆی گیان لە دەستدان ریز بەند دەکرێت و ئەم سێ دیاردەیەش هەر سێکیان لەو دیاردانەن کە دەکرێت مرۆڤ بەریان لێبگرێت و نەبنەهۆی گیان لەدەست دان . ئەلکحول بەم رێژە سەدییانەی خوارەوەدەبێتە هۆی توشبوون بەم نەخۆشییانە: -٣٢% ی بەریشاڵبوونی جگەر -٢٩% ی شێرپەنجەی سورێنچک - ٢٥% ی شێرپەنجەی جگەر - ٢٤% ی کوشتنی ئەندامانی خێزان - ٢٠% ی رووداوی هاتووچۆ -١٩% ی شێرپەنجەی ناودەم و قوورگ - ١١% ی خۆکوشتن – ١٠ % ی لێدان (جەڵتە) ی مێشک - ٧% ی شێرپەنجەی مەمک

تەمەن و رەگەز : بەرزترین رێژەی ئالوودەبوون بەمەی خواردنەوە وە لەتەمەنی ١٨ تا ٣٠ ساڵیدایە و بەپێی درێژی تەمەن رێژەکەی کەم دەبێتەوە و لەرەگەزی مێینەدا نیو ئەوەندەی رێژەی نێرینە مەی خۆر هەیەو دوو بۆ سێ ئەوەندەش لەکیشوەری ئاسیادا کەم دەبێتەوە و لەرۆژهەڵاتی ناوەراستیشدا بەدەگمەن مێینە ئالوودەی مەی دەبێت

## زیانەکانی ئەلکحول:

بەردەوام خواردنەوەی ئەلکەول دەبێتەهۆی ئەم زیانانە:

١- زیانی جەستەیی : مرۆڤی ئالوودەبوو بە ئەلکحول هەرچەند مەی زۆر بخواتەوە و کار لەتەندروستیشی بکات زیانەکانی جەستەیی خۆی نابینێت بۆیەلەسەر خواردنەوەی مەی بەردەوام دەبێت.

زیانەجەستەییەکان ئەمانەن : برینی دوانزەگرێ و گەدە، هەوکردن و شێرپەنجەی سورێنچک ،هەوکردنی پەنکریاس ،هەوکردن و بەریشالبوونی جگەر، کەم خوێنی و نەخۆشی ماسوولکەی دڵ.

٢- زیانی دەماریی ودەروونیی : وەکو لە بیرچوونەوە، خۆکوشتن ،خۆئازاردان،تێکچوونی باری هۆشەنگی و گۆرانی کەسێتی ،نەخۆشیی خەمۆکی ،دڵەراوکێ وپەرکەم.

٣ -زیانی کۆمەڵایەتی : خواردنەوەی مەی بەبەردەوامی دەبێتەهۆی زیانی کۆمەڵایەتی وەکو : دەستدرێژیکردنەسەر خێزان ،گیروگرفتی سۆزو هەڵسوکەوت لەناو ماڵدا ،کەمبوونەوەی توانای کاری رۆژانە،دواکەوتن و ئامادەنەبوون لەکاری رۆژانەدا ، لەکاردەرکردن و دەرئەنجام بێکاربوون، لادانی کۆمەڵایەتی وسێکسی و توشبوونی بەجۆرەها تاوان.

٤-دیاردەی کشانەوەی ئەلکحول : بەهۆی هەر هۆیەک بێت ئەگەر نەخۆش بۆ ماوەیەک ئەلکحولی نەخواردەوە،ئەلکحولی دەست نەکەوتبێت یا تووشی کارەساتێکی کتوپر بوو بێت تووشی دیاردەی کشانەوەی ئەلکحول دەبێت کەنیشانەکانی ئەمانەن : دڵتێکەڵهاتن و رشانەوە ،سکچوون،دڵەراوکێ و ماخۆلان ،لەرزین ،پەرکەم ، بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای لەش (تا)، خێرالێدانی دڵ ،ورێنەی هزر و ورێنەی بینین و بیستن.

## ڕێگەگرتن لێی:

یەکەم : دەستنیشانکردنی ژمارەی ئالوودەبوونی بەئەلکحول بە کۆکردنەوەی زانیاریی و ناردنی تیمی گەڕۆکی خاوەن ئەزموون بەتایبەتی لەناو گەنجان و گرووپەبێکارو هەژارەکاندا.

دووەم : مەشقپێکردنی پزیشک و کارمەندو توێژەری کۆمەڵایەتی بۆ ئەوەی زانیارییان لەم جۆرەگرفتەدا هەبێت و بتوانن مامەڵەی لەگەڵدا بکەن.

سێیەم :بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زانیاریی جەماوەر دەبێت هاوڵاتیان ڕاگەیاندنی ڕاستەوخۆ ، ڕۆژنامە،گۆڤارو میدیاکانی بیستن و بینین ئاگاداربکرێنەوە.

چوارەم : پەرلەمانی کوردستان پێویستەچەند بڕیارێک بۆ کەمکردنەوەی مەی خواردنەوەلەناو دانیشتوواندا دەربکات و دەبێت دەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستانیش بۆ ئامادەکردنی پرۆگرام و جێ بەجێکردنی ئەم بڕیارانە لە لایەن وەزارەتەوە پەیوەندی دارەکانەوەرۆڵێکی سەرەکییان هەبێت.

## بڕیارەکان ئەمانەن:

١ .گرانکردنی نرخی ئەلکحول لەرێگەی زیادکردنی باجەوە.

٢.کورتکردنەوەی ماوەی فرۆشتنی مەی لەبازارەکاندا

٣.کەمکردنەوەی بری مەی لەناو بازارەکاندا

٤.تەنها ئەو فرۆشگایانە مافی فرۆشتنی مەییان هەبێت کەبەیاسا مۆڵەتیان پێدەدرێت.

٥.نابێت بە هیچ شێوەیەک مەی بەمێرد منداڵ بفرۆشرێت.

٦هەرکاتێک پێویست بێت تێستی ئەلکحول بۆ شۆفێر بکرێت.

٧.دانانی پرۆگرامی ڕ ۆشنبیری تەندروستیی بۆ قوتابخانەو زانکۆکان.

زانیاری بۆ کەسێک بەبڕێکی زۆر کحول دەخواتەوە لەکۆی ئەم نۆ ٩ پرسیارە وەڵامی ٥ پرسیارت بە بەڵێ وەڵام داوە، مانای هۆشدار بە ئالوودەبونی کحولت هەیە.

پرسیاریی یەکەم: بەهۆی کێشە، یاخود دۆخێکی دژوار و نالەبارت ،پەنا دەبەیت بۆ کحول ؟

- پرسیاری دووەم: کحول دەخۆیتەوە، بەهۆی تورەبوونت لەیەکێک لەهاوڕێکانت، خێزان یاخود کەسێکی دەوروپشت؟

پرسیاری سێیەم: حەزدەکەیت زیاتر بەتەنها کحول بخۆیتەوە، لەوەی لەگەڵ هاورێکانت؟

پرسیاری چوارەم: خواردنەوەی کحول کاریگەری خراپی کردوەلەسەر خوێندن یاخود کارکردنت؟

پرسیاری پێنجەم :هەوڵت داوەلەخواردنەوەی کحول وازبێنیت یاخود کەمی کەیتەوە، بەڵام نەتتوانیوە؟

پرسیاری شەشەم: رویداوە بەیانیان پێش چوونت بۆ قوتابخانەیاخود شوێنی کارکردنت کحولت خواردبێتەوە؟

پرسیاری حەوتەم: کحول دەخۆیتەوە وەک هەولێک بۆ تێنوتی شکاندن؟

پرسیاری هەشتەم: ئایا لەکاتی خواردنەوەی کحول هەست بەبوورانەوەدەکەیت؟

پرسیاری نۆیەم: هەمیشە هەوڵ ئەدەیت خۆت لەباسی کحول خواردنەوەت لادەی؟

## ئایا ئالوودەبوون بەئەلکحول چارەسەری هەیە؟

لە وەڵامدا دەڵێین بەڵێ، چارەسەری هەیەو تا زوو چارەسەری بکرێت باشترە، بەڵام گرنگترین خاڵی چارەسەری لەخودی نەخۆش خۆی دەست پێدەکات، واتە یەکەمجار دەبێت نەخۆش بڕیارێکی تەواوی دابێت بۆ وازهێنان لەئەلکحولو لەم بڕیارەشدا پەشیمان نەبێتەوە. ئەگەر ئالوودەبوونەکە زۆر توونـد بوو ئەوا نەخۆشەکە دەخەوێنرێت، بەڵام ئەگەر ئاڵودەبوونەکە زۆر تونـد نەبوو، دەکرێت نەخۆش بەبێ خەواندن لەنەخۆشخانە چارەسەر بکرێت، واتە ڕۆژانە یان دوو ڕۆژ جارێک سەردانی پزیشکی چارەساز بکات.

لەگرنگترین خاڵەکانی دوای چارەسازی:

- دوورکەوتنەوەی نەخۆشە لەو شوێنانەی مەی لێ دەخورێتەوە.

- دوورکەوتنەوەی لەو هاورێیانە کە مەی دەخۆنەوە، واتە بە شێوەیەکی گشتی کەسێک یان شوێنو بارودۆخێک ببێتەهۆی هاندانی بۆ دووبارەخواردنەوە پێویستە لێی دووربکەویتەوە.

## زیانەکانی ئەلکحول چین؟

ئایا ئەلکحول هیچ سوودێکی هەیە؟ لەراستیدا ئەلکحول زیانەکانی گەلێ زۆرن، دابەش دەکرێن بۆ:

زیانەدەروونی.

جەستەیی.

ئابووری.

کۆمەڵایەتییەکان.

## زیانە جەستەییەکان:

. لەگرنگترین زیانەجەستەییەکان

ـ ئەگەری تووشبوونە بە نەخۆشی شەکرە

ـ هەوکردنو شێرپەنجەی جگەر

ـ هەوکردنو شێرپەنجەی پەنکریاس

ـ شێرپەنجەی گەدەو ریخوڵە

ـ هەوکردنی مێشک ...هتد.

## زیانە دەرونیەکان:

لەدیارترین زیانەدەروونییەکان بریتین:

ـ گرفتی لەبیر چوونەوە.

ـ تووش بوون بەنەخۆشی خەمۆکی.

ـ دڵەراوکێ.

ـ سایکوسیس.

ـ وەهمی بەدگومانی، بەتایبەتی کاتێک توانای سێکسی نامێنێت.

ـ گومانی خراپ بەخێزانەکەی دەبات.

ـ ڕ ەفتاری نابەجێو سەیر.

ـ یان رەفتاری توندو تیژی، ئاڵوودەبوون بەماددەی تری هۆشبەر...

## زیانە ئابوریەکان:

ـ لەنێویاندا سەرفکردنی پارەیە.

ـ هەروەها بەهۆی ئاڵودەبوون ناتوانێت کارەکانی راپەڕێنێتو ئیشو کاری پێ ناکرێت.

ـ ئەمەش نەک هەر تەنها زیانی بۆ خۆیو خێزانەکەیەتی، بەڵکو زیانێکی گەورەبەوڵات دەگەیەنێت، کەپێویستی بەتواناکانی ئەوە، لەبەرچاوترین زیانەکۆمەڵایەتییەکانیش.

## زیانە کۆمەڵایەتیەکان:

تێکچوونی پەیوەندی لەگەڵ خەڵک و گۆشەگیری و لێک هەڵوەشانەوەی خێزانە.

ئەوە ماوە بڵێین ئایا ئەلکحول سوودی هەیە؟

لەراستیدا لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان سەلماندووەخواردنەوەی یەک یەکە(یەکە= ٨ گرام) لەئەلکحول مرۆڤ لەنەخۆشییەکانی دڵ دەپارێزێت، بەڵام پرسیارەکەلێرەدا ئەوەیە، تا چەند گەرەنتی هەیەئەم مرۆڤەلەم ڕێژەیەزیاتر نەخواتەوە، یان خۆی پێ دەگیرێت زیاتر نەخواتەوە؟ ئایا هەموو ئەو مرۆڤانەی ئەلکحول دەخۆنەوە مەبەستیان خۆ پاراستنە لە نەخۆشیەکانی دڵ؟ ئایا خواردنەوەی مەی (کەئەگەری تووشبوون بەگرفتی زۆری لێ دەکەوێتەوە) تا کەرێگەیە بۆ خۆ پارستن لەنەخۆشییەکانی دڵ، لەکاتێکدا ڕێگای کاریگەرتر هەیە وەک شێوازی خواردن یان وەرزش کردن.

ئەگەر نیازی یارمەتی دانی کەسێکی ئالوودەبووت هەیەپێویستە ئەم خالآنە ڕەچاو بکەی. خۆت باش ئامادە کە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ ئەوکەسە باسی ئەوە بکە کە مەبەستی خۆتێکەڵاوکردنت لەژیانی تایبەتی ئەو لەبەرژەوەندی ئەوە بەهیچ شێوەیەک نابێت ئەوکەسە بەچاوێکی سوک سەیر بکەی ڕێگا بدە ئەوو کەسە ئاخاوتن بکات و باسی هۆی ئالۆودەبونی بکات.

هەوڵ بدە متمانەیەک لەنێوانتان دروست بێت، کە ببێتە هۆی ئەوەی ئەو کەسە هیچ نهێنیەکت لێ نەشارێتەوە گفتی هەوڵدانی یارمەتی پێ بدە ئەگەر لەتوانات هەیە یارمەتی بدەیت، یاخود لێی بپرسە بە چی شێوەیەک دەتوانی یارمەتی بدەی بەهیچ شێوەیەک نابێت ئاخاوتنەکانی نێوانتان لای هیچ کەسیکی تر باس بکرێت ئەگەر بەرەزامەندی ئەوکەسەخۆی نەبێت هەڵە نییە ئەگەر پێشنیاری ئەوەبکەیت کەداوای یارمەتی بکرێت لەکەسانی شارەزاو بەتوانا هەوڵ بدە زانیاری کۆ کەیەوە لەسەر ئالۆودەبون بۆ ئەوەی بتوانی باسی زیانەکان و گیروگرفتەکانی بکەی لەگەڵیدا.

## کاریگەریی چارەسەرکردنی ئەلکحول:

چارەسەرکردنی ئالوودەبوون بەئەلکحول زۆر پارەی کەمتر دەوێت، وەک لەبەردەوامی بەئالوودەبوون، بۆ ئەم مەبەستانە چارەسەرکردنی نەخۆشی ئالوودە بوو بە ئەلکحول پێویستە:

گەڕانەوەی مەیخۆر بۆ ناو کۆمەڵ و بتوانێت وەکو مرۆڤێکی بەرهەمێنەر کاربکات. چارەسەرکردنی مرۆڤی مەیخۆر ٤٠-٦٠% ی ڕێژەی تاوان کەمدەکاتەوە. [٢١]

---

[٢١] null@example.com (Barham Eng)

## بیست و حەوت: جێبەجێکردنی ئەحکامە شەرعیەکانی تایبەت بە خێزان( مقصد تطبيق الاحكام  الشرعية المختصة بالأسرة)

ئامانجی شەریعەت ئەوکاتە دێتەدی کە جێبەجێبکرێ لە ناو کۆمەڵگاو خێزاندا، زۆر ئەحکام هەیە کە لە میانەی خێزان جێبەجێدەکرێ وەک:

-حوکمەکانی داخوازیکردنی هاوسەر.

-سەیرکردن.

-هەڵبژاردنی بەرامبەر.

-ئەوانەی دروستن یان دروست نین هاوسەرگیریان لە گەڵدا بکرێ.

-مەرجەکانی مارەبرین.

-دواتر حوکمەکان و مافەکانی دوای هاوسەرگیری.

-پەیابوونی مەحرەمیەتی خزمایەتی.

-ئەحکامی دووگیانی.

-مناڵبون و هۆزەبانە وناولێنان.

-بابەتی نەفەقە.

-فێرکردنی ئەحکامەکانی دین بە مناڵەکان وەک نوێژ، ڕۆژوو، ئادابەکان.

-ئەحکامی شیردان و ماوەکەی و شیردان بە غەیری مناڵی خۆت و ئەحکامەکان.

-بابەتی ئیسپاتبوونی ڕەچەڵەک.

-باسی میرات.

-باسی زیهار.

-باسی بێ نوێژی.

-باسی سوێند خواردن بۆ نەچونە لای خێزان و ئەحکامەکانی.

-باسی ئەحکامەکانی تەڵاق و جیابونەوە.

-باسی دایەنی.

-باسی لعان و خیانەتی هاوسەرگیری.

-باسی بوهتان.

زۆر شتی تر کە ئەم ئەحکامانە لە میانەی خێزاندا دێنە دی بێجگە لە لایەنی عیبادەت و ڕەوشت و پەیوەندیەکان، کەواتە لێرەوە تێدەگەین کە هاوسەرگیری دەرگایەکی فراوان و گەورە دەکاتەوە بۆ جێبەجێکردنی شەریعەت، کەواتە ئەی کورو کچان کە دڵسۆزی و حەماسەتان بۆ جێبەجێکردنی شەریعەت هەیە هەتا زووە هاوسەر گیری بکەن، بۆ ئەوەی شانازی جێبەجێکردنی ئەو هەموو ئەحکامە شەرعیەتان بەرکەوێ.

بیست و هەشت :وەدیهێنانی بەختەوەری(مقصد تحقيق السعادة)

عیزی کوڕی عبدالسلام لە هەر دوو کتێبی ( قواعد الكبرى و قواعد الصغرى) دەڵێ:

شەریعەت بۆ دوو شت هاتووە:

یەکەم: وەدیهێنانی لەزەت و خۆشی و هۆکارەکانیان.

دووەم: دوورخستنەوەی ئازارو خەم و هۆکارەکانیان.[٢٢]

---

[٢٢] القواعد الكبرى والقواعد الصغرى / عز بن عبد السلام.

گومان لەوەدا نییە کە خێزان باشترین هۆکاری بەختەوەرییە بە هۆی هاوسەر، باوک ودایک، منالْ و نەوە، هەبونی مالْ و جێگاو رِێگا، ئابوری سەربەخۆ، دیاربونی ئەرک و ماف، بەرچاو رِوونی لە ژیان، سەرقالْبون بە کاری باش و گرنگ، پەروەردەکردنی منالْ، دلْخۆشکردنی خەلْکانی تر، فراوانبونی پەیوەندیەکان لە گەلْ مالْی خزمانی هاوسەرو هەتا منالْەکانیشت، بۆیە ئەگەر ئێستا رِاپۆرتێک بکرێ لە گەلْ ئەو کەسانەی کە خاوەنی هاوسەرن و خاوەنی هاوسەرنین، ور چەند پرسیارێکی پەیوەست بە بەختەوەریان ئاراستە بکەی، بۆت رِووندەبێتەوە کە ئەوانەی دەرفەتی هاوسەرگیریان بۆ نەرِەخساوە، یان نەیانویستوە چەند جیاوازیان هەیە لە رِووی تەندروستی و دلْخۆشی و ئاسودەیی.

## بیست و نۆ: وەدیهێنانی رِەفاهیەت( مقصد تحقيق الرفاهية)

رِەفاهیەت بۆ مرۆڤ یەکێکە لە ئامانجەکانی شەریعەتی ئیسلامی پیرۆز، وەک ئەو وتەیەمان باس کرد کە سولْتانی زانایان عیزی کوری عەبدوسەلام فەرموویەتی،خوای گەورە ئاسمان زەوی بۆ مرۆڤ و خۆشی مرۆڤ دروستکردوە، ئەمە لە چەندین ئایەتدا باسکراوە وەک دەفەرموێ: فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبۡنَا ٱلۡمَآءَ صَبّٗا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقۡنَا ٱلۡأَرۡضَ شَقّٗا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا ﴿٢٨﴾ وَزَيۡتُونٗا وَنَخۡلٗا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلۡبٗا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةٗ وَأَبّٗا ﴿٣١﴾ عبس: ٢٤-٣٢

دەبینی کە خوای گەورە باسی بەهرەی خواردن و دابەزینی ئاو و قلْیشانەوەی زەوی و رِوانی دانەوێلْەو ترێ و جۆرەها میوەو خورماو زەیتون و گیا دەکا دەفەرموێ ئەوانە هەمووی بۆ مرۆڤە و لە پێناو مرۆڤدایە،ناو خێزان باشترین جێگای وەدیهاتنی رِەفاهیەت و خۆشییە کۆبونەوەی خێزانی خۆشییەکە کە بەس ئەوروپاییەکان هەست بە لەدەستدانی دەکەن چونکە لە دەستیان داوە، دیارە خێزان بە رِێگای هاوسەرگیریدا تێدەپەرِێ

## سێ: پەروەردەکردن( مقصد التربية)

تەزکیەو پەروەردەکردنی مرۆڤ یەکێکە لە سێ ئامانجە سەرەکیەکە، ئەو سێ ئامانجە کە توحید،تزکیة. تعمیر،ن لە ناویاندا پەروەردەی مرۆڤ لە راستیدا لەم سێ ئامانجە دوویان ڕاستەو خۆ بۆ مرۆڤن واتە پەروەردەو ئاوەدانکردنەوە، چونکە مرۆڤ خۆی لە سەر ئەم زەویە دەژی، ئێستا کە زەوی هەرەشەی لەسەرە لە بەر زیادەڕەوی مرۆڤ لە پیسکردنی ژینگەو خراپ بەکارهێنانی ئاو و زیادە ڕەوی لە سوتاندنی سوتەمەنیەکان بە هەموو جۆرەکانی ئەوە تەنیا مرۆڤ خۆی زیانی بەردەکەوێ، پەروەردەکردنی مرۆڤ هەموو لایەنەکانی ژیانی مرۆڤ و زیندەوەران دەگرێتەوە، بۆیە دەبێ مرۆڤ پەروەردە بکرێ بۆ ئەوەی ڕێز لە خۆی و خەڵکان و ژیان و ژینگە بگرێ، باشترین پەروەردەو یەکەم قوتابخانەی منالْ لە ماڵەوە فێری دەبێ، با بەوە هەڵنەخەڵەتێین کە لە ئەوروپا مناڵەکان لە بەرچاوی باب و داکیان هەڵدەگیرێن و دەبرێن بۆ دایەنگەو فێرگەی تایبەت بۆ ئەوەی پەوەردەیان کەن وا مەزانە ئەمە ڕاستە و زانستییە، چونکە هیچ کاتێک پەروەردەی خەڵک ی بێگانە لە گەڵ مناڵدا وەک باوک و دایکی خۆدی منالْ نییە، بۆیە دیسان هاوسەرگیری ڕێگەی هەرەگرنگی پەوەردەی مرۆڤە بۆ ئەوەی تاکێکی باش و گونجاو بن بۆ کۆمەڵکا بێتەدی.

## سێ و یەک: فێربوونی وەفاو ئەمەک( مقصد تعلم الوفاء)

یەکێک لەو ڕەوشتانەی کەمرۆڤایەتی لە سەری کۆکە بابەتی وەفاو ئەمەکە بەرامبەر خەڵک بەتایبەت ئەوانەی چاکەت لە گەڵدا دەکەن، بێوەفایی هەتا لە ئاژەڵانیشدا شتێکی قەبوڵنەکراوەو ناشیرنە بۆ نمونە ئەگەر سەگێک نان بدەی لە هیچ شوێنێک پێت ناوەڕێ، ئەگەر مریشکێک یان مانگایەک یان گوێدرێژێک لە ماڵەوە خزمەت بکەی بەڵام نەیەتەوە ماڵەوەو هەموو ڕۆژێک بە دوایەوە بی گومان لەوەدا نییە لێی قەبوڵ ناکەی و یان سەری دەبڕی یان دەیفرۆشی چونکە دەڵێی بەکەڵک نایە بێ ئەمەک و بێوەفایە من بۆ خۆمی

پێوە ماندوو بکەم، لە ماڵەوە کەسێک لە گەڵ دایکی یان باوکی بە ئەمەک و وەفا نەبێ خەڵک هەموو گازندەی لێدەکات چونکە ئەگەر ئەهلی وەفا با ئەوە باوک و دایکی خۆی لە هەر کەس ئەولاتر بوون بە وەی لە گەڵیاندا بە وەفا بێ، چەند ناشیرنە کاتێک پیاوێک ژنەکەی لە کاتی نەخۆشی یان پیری پشتگوێدەخا دەوترێ کەسێکی بێوەفایە، ئەمە بۆ ئافرەتیش هەر ڕاستە

کەواتە هاوسەرگیری وا لە مرۆڤ دەکا ئەگەر بە ئەمەک و بەوەفا نەبێ عەیب و ناشیرن بێ، خوای گەورە واجبی کردوە لە سەرمان کە بەرامبەری خوای گەورە خاوەنی وەفا بین، وە بەرامبەر هەرکەسێک چاکەی لە گەڵدا کردوین بە چاکە وەڵامی بدەینەوە وەک دەفەرموێ:

یَـٰٓأَیُّهَا ٱلَّذِینَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِ (المائدة: ١)

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بەئەمەک و بەوەفا بن بەرامبەر بەڵێن و پەیمانەکانتان.

هەروەها دەفەرموێ: ...وَبِعَهۡدِ ٱللَّهِ أَوۡفُواْ ... (الأنعام: ١٥٢) واتە بەرامبەر بەڵێنێک کە بە خوای گەورەتان داوە بە وەفاو ئەمەک بن

کەواتە هاوسەرگیری قوتابخانەی فێربوون و مومارەسەکردنی ئەمەک و وەفایە بە رامبەر یەکترو هەموو ئەندامانی خێزان.

## سی و دوو:فێربوون و فێرکردن(مقصد التعلم والتعليم)

ژیانی هاوسەری زۆر شت فێری مرۆڤ دەکا کە پێشتر هەر نەیزانیون، یان بەو ئەندازەیە لێیان شارەزا نەبوو، یان بە هەڵە لێ یان تێگەیشتبووە، نازانی باوکایەتی چیە تا منالّت نەبێ، نازانی دایکایەتی چیە تامنالّی خۆتت نەبێ، نازانی خۆشەویستی بۆ هاوسەر بۆ منالّ بۆ مالّی خۆت چییە تا خۆت نەیبینی و بە کردەیی مومارەسەی نەکەی، لە سەروی ئەوانەشەوە مرۆڤ دەبێ شتانێک

فێربێ کە پێشتر نەیزانیوون هەم دەربارەی دین، هەم دەربارەی دونیا، هەم دەربارەی خۆی ، هەم دەربارەی خەڵک، هەم دەربارەی بەرپرسیاریەتی، ماڵپاراستن،مناڵ پەروەردەکردن، نازی هاوسەر ڕاگرتن، هەڵس و کەوت لە گەڵ کەس و کاری خۆت و هاوسەرەکەت. هەتا دوور نەکەویەوە نازانی خۆشەویستی باوک، دایک، برا، خوشک، دایە گەورەو بابە گەورە چییە، کە دوورکەوتییەوە ئەوجار بیر لە نازی دایک و باوک دەکەیەوە، ئەو خوشکەی جاری وابوو لە بەر هۆکارێکی لاواز نەتدەدوانت و قسەت لێڕادەگرت، ئێستا موشتاقی دیداری ئەویت بەلام پێت ناکرێ، مناڵەکان، ماڵ، میوان ، بەرپرسیاریەتی دەستیان بەستوی، کچان کوران کەم لە ئەحکامەکانی هاوسەرگیری دەزانن دواتر فێر دەبن، وە هاوسەران هیچ دەربارەی مناڵ نازانن دواتر فێردەبن، بۆیە هاوسەرگیری قوتابخانەیە، زانکۆیە، مەشق و ڕاهێنانە، خۆزگە قەدری ئەم خوێندنگایەمان دەزانی و مافی خۆیمان پێدەدا.

## سی و سێ: وەدیهێنانی هاوپەیمانیەتی توندوتۆڵ(مقصد تحقيق الميثاق الغليظ)

خوای گەورە ناوی لە پەیوەندی نێوان ژن و مێرد ناوە پەیمانی توندو تۆڵ وەک دەفەرموێ: وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا (النساء: ٢١) واتە: جا چۆن دروستە مارەییان لێوەربگرنەوە، لەکاتێکدا ئێوە چوونەتە لای یەکترو ژنانیش پەیمان و بەڵێنێکی گەورەو گرنگیان لێ وەرگرتوون (لەکاتی مارەکردنیاندا).

پێغەمبەری خواش دەفەرموێ علیە الصلاة والسلام: ( **أَحَقُّ الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ**.) رواه البخاري، ٢٧٢١

واتە: ئەولاترین و شایەنترین مەرجێک کە ئێوە پێیەوە پابەندبن ئەی پیاوان ئەوەیە کە خێزانەکانتان پێ حەلاڵ کردووە.

واتە: ئەو مەرجانەیە کە لە کاتی مارەبڕیندا کردوتانە لە گەڵ خێزانەکانتادا، چونکە مارە برین کاری یەکەمی کردەییە بۆ حەڵاڵ بوونی هاوسەران لە یەکتر بۆیە دەبێ وریای بەڵێن و پەیمانەکانیان بن، وە هیچیان بەڵێنی وا بە هاوسەرەکەی نەدا کە بۆی جێبەجێناکرێ جا چ مادی بێ، یان مەعنەوی بێ.

ئەگەر هاوسەران لە گەڵ ئەو پەیمانەدا ڕاستبوون ئەوان منالەکانیشیان هەموو وەفاو و ئەمەک فێر دەبن و بەڵێن و پەیمانەکانیان دەپارێزن، بۆیە ئەگەر دەمانەوێ منالەکانمان پەروەردە بکەین ئەوە پێویستی بە زۆر قسەکردن و ئامۆژگاری کردن نییە، بەڵکو پێویستی بە جێبەجێکردنی بەڵێن و پەیمانەکانە کە بە هاوسەرانمان داوە، یان بە خودی منالەکانمان داوە.

خوای گەورە کە باسی بەندە ژیرو بەهەشتیەکانی دەکا دەفەرموێ: ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ (الرعد: ٢٠)

واتە: ئەو کەسانەن وەفا دەکەن و بەئەمەکن لە بەرامبەر ئەو پەیمانەوە کە هەیانە لەگەڵ خوای پەروەردگارداو، ئەو پەیمانەش ناشکێن و بەڵێن هەڵناوەشێننەوە....

هەمدیس خوای گەورە کە وەسفی ئیبراهیم دەکا سەلامی خوای لێبێ دەفەرموێ: وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ (النجم: ٣٧) واتە: وە بەوەی کە لە پەڕاوی ئیبراهیم دایە ئەو ئیبراهیمەی کە لە پەیمانی خۆی بەچاکی بەجێ هێنا.

هەروەها خوای گەورە کە باسی ئیسماعیل دەکا سەلامی خوای لێبێ دەفەرموێ: وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ إِسْمَٰعِيلَ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا (مريم: ٥٤)

واتە: ئیسماعیلیش باس بکە لە قورئاندا، بە ڕاستی ئەو لە بەڵێن و پەیمانەکانیدا ڕاستگۆ بوو، ئەو پێغەمبەرو ڕەوانە کراوی خوا بوو.

## سی و چوار: دوورکەوتنەوە لە گۆشەگیری(مقصد التجنب عن الانعزال)

ئیسلام دینی گۆشە گیری نییە بەڵکو دین ی کۆکردنەوەی دین و دونیا، دونیاو دوا ڕۆژ، تاک و کۆمەڵگا، روح و لاشە ، نێرو مێ ، ژیان و ژینگە، حەرب و میحراب ، تەقواو تەقەیە، بۆیە هاوسەر گیری بە جوانترین شێوە ئەو ئامانجە بە دیدێنێ کە مرۆڤ لە گۆشەگیری و تەنیایی دور دەخاتەوە.

گۆشەگیری لە ئیسلامدا هەیە بەڵام بە تێگەیشتن و واتای جیاواز وەک پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی: (لكلِّ نبيٍّ رهبانيةٌ ورهبانيةُ هذه الأمةِ الجهادُ في سبيلِ اللهِ) [٢٣]

ئەم فەرمودە هەرچەندە بەم دەستە واژە لاوازە، بەڵام فەرمودەی سەحیحمان هەیە، وەک ئەو کەسانەی هاتنە ماڵێ پێغەمبەرو لە خواپەرستی ئەویان پرسیار کرد، وە ئەو فەرمودەی کەعوسمانی کوری مەزغون کە ژنەکەی پاشگوێ خستبو، وە فەرمودەکەی سەلمان لە گەڵ ئەبودەردا.

لە دیارترین نیشانەکانەکانی ڕەهبانیەت لە مەسیحییەت و هیندۆسی و بوزای دورکەوتنەوە لە خێزان و خۆشیەکانی دونیایە، بەڵام لە ئیسلامدا ئەو تێگەیشتنە ڕاست پێچەوانەیە، پێغەمبەری خوا کە راسترین و بەتەقواترین و دونیا بەکەمگرترین کەس بووە بەڵام کە مردوە نۆ خێزانی هەبووە، دونیا بە کەمگری ئەوە نییە کە دونیات نەبێ. بەڵکو ئەوەیە خۆت نەدۆڕێنی لە پێناویدا، ڕاستیەکان وون نەکەی لە پێناویدا، دونیات تەنیا بۆخۆت نەوێ و خەڵکانی تری لێ مەحروم بکەی.

---

[٢٣] ـ رواه احمد ،١٣٨٠٧، السلسلة الصحيحة، ٩٥/٢

## سی و پێنچ: پاداشتی بەخشین لە پێناوی خوادا(مقصد الانفاق فی سبیل الله)

یەکێک لەو خەسڵەتە گرنگانەی کە دەبێ لە مرۆڤی مسوڵماندا هەبێ بەخشندەییە، قورئانی پیرۆز زۆر باسی خەسڵەتی بەخشندەیی کردوە، وە زۆر سەرکۆنەو زەمی نەبەخشین و دەست قوچاندنی کردوە، بەشێک لە بەخشینەکان واجبە وەک زەکات و کەفارات و نەزرەکان، وە لەو بەخشینانەی کە واجبە نەفەقەی ماڵ و مناڵە، پیاو ئەگەر خێزانەکەی دەوڵەمەندیش بێ هەردەبێ نەفەقەی بکێشێ و واجبە، وە مرۆڤ یەکێک لە تاوانە گەورەکان ئەوەیە کە قوتی ماڵ و مناڵی بە زایا بدات وەک پێغەمبەری ئازیزمان فەرموویەتی علیه الصلاة والسلام: ( كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ يَقُوتُ.) رواه أبو داود،١٦٩٢ واتە: تاوان بۆ مرۆڤ ئەوەندە بەسە کە ئەوانەی نەفەقەو ژیانیان لەسەریەتی بە زایایان بداو پشتگوێیان بخاو برسیان بکا، هەتا ئەو ماڵاتە، یان ئەو پەڕەوەرەی کە لە ماڵەوە ڕایدەگری نابێ نەفەی لەسەرت واجبە نابێ برسی و تینویان بێ و دەبێ ئاگات لە گەرماو سەرمایان بێ

بۆیە هاوسەرگیری باشترین مەشق و ڕاهێنانە لەسەر بەخشندەیی کە لە سەدان ئایەت و سەدان فەرموودەدا هاتوە و باسی گەورەیی کراوە. هاوسەرگیری بە بەخشندەیی دەست پێدەکا هەر:

- لە داخوازیکردنەوە.
- لە مارەبرینەوە.
- لە گوستنەوەوە.
- لە وەلیمەکردن.

-لە بەخێوکردن.

-لە هۆزەبانەی منداڵەکان.

-لە بەخێوکردنی منداڵەکان.

-هەتا دوای مردن بە هۆی میراتەوە بەخشندەییەکەت بەردەوام دەبێ.

-هەتا ئەو وەسیەتەی کە مرۆڤ دەیکا بۆ دوای مردن.

ئیسلام بەو شێوەیە مرۆڤ هەڵدەنێ لەسەر سیفەتی بەخشندەیی ، وە بێ منەت و ئازاردانی بەرامبەر وەک خوای گەورە:

دەفەرموێ: يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبْطِلُواْ صَدَقَـٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ كَٱلَّذِى يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّمَّا كَسَبُواْ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ (البقرة: ٢٦٤)

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، نەکەن خێرو پاداشتی چاکەکانتان پووچ بکەنەوە بە منەت نان و دڵ ئازاردانی (هەژاران)، وەکو ئەو کەسەی ماڵ و سامانی خۆی لەبەر چاوی خەڵکی ببەخشێت بۆ ڕیاکاریی و خۆنواندن و ئیمان و باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی نەبێت، جا نموونەی ئەو جۆرە کەسانە وەک بەردێکی ساف وایە کە خۆڵێکی بە سەرەوە بێت، لەوەودوا بارانێکی لێزمە بباریێت بەسەریداو هیچی بەسەرەوە نەهێڵێت و بەرەق و تەقی بەجێی بهێڵێت و حەقیقەتی دەربکەوێت، (ئینجا ئەو جۆرە ڕیابازو بێ باوەڕ منەتنەرانە) هیچ جۆرە بەهرەیەک لەو بەخشینەیان بەدەست ناهێنن، بێگومان خوای گەورە ڕێنموویی قەومی بێ باوەڕو کافران ناکات.

## سی و شەش: وەدیهێنانی ئاوات و خۆزیای باوکودایک(مقصد تحقيق أمنية الوالدين)

لە دوای خوا جل جلاله، وە لە دوای پێغەمبەری خوا عليه الصلاة والسلام، گەورەترین ماف بەسەر مرۆڤەوە مافی دایک و باوکە، جا ئەو دایک و باوکە مسوڵمان بن یان کافر، باش بن یان خراپ، ئەمە ڕیزبەندییە بە ڕوونی لە قورئانی پیرۆزدا دەبینین وەک خوای گەورە دەفەرموێ:

وَٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا

وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا

وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ

وَٱلْيَتَٰمَىٰ

وَٱلْمَسَٰكِينِ

وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ

وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ

وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ

وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ

وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ

إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا (النساء: ٣٦)

واتە: (ئەی خەڵکینە) تەنها خوا بپەرستن و هیچ جۆرە شەریک و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن و چاکەکار بن لەگەڵ دایک و باوکتان و خزمان و هەتیووان و هەژاران و دراوسێی خزم و دراوسێی نزیک و دراوسێی بێگانەداو هاوەڵی کارو سەفەرو ڕێبوارو ژێر دەستەکانتاندا، بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش ناوێت کە خۆدەنوێنن و فیزدەکەن و فەخر دەفرۆشن بەسەر خەڵکیدا.

دەبینین لەو دە ١٠ مافە گرنگە کە خوای گەورە لە یەک ئایەتدا کۆیان دەکاتەوە دوای مافی خوا کە تەوحیدو یەکتا پەرستییە یەکسەر باسی مافی باوک و دایک دەکا.

جا دیارە خۆزیاو ئاواتی هەر باوک و دایکێک ئەوەیە کە کچەکەی لە کەژاوەی هاوسەرگیریدا ببینێ و، ببینێ کە کوڕەکەی ژن دەهێنێ، ئایا وەدیهێنانی ئەو ئاواتە گرنگ نییە؟، ئایا باوک و دایک حەزو ئاواتیان ئەوە نییە کە منداڵی منداڵەکانیان لە باوەش بگرن وخۆشەویستیان بۆ دەربڕن؟ بێگومان وایە بۆیە ئەی کچان و کوران ئەگەر خوای گەورە ئەم پرۆسەیەی بۆ ئاسانکردن لە دەستی مەدەن و ئەم خۆزیاو ئاواتەی باوکان و دایکانتان وەدیبێنن، وە بە کەمی مەزانن، چونکە بەس خوا دەزانی دڵخۆشکردنی باوکان و دایکان چەندە خێرە بە هۆی کاری باشەوە.

## سی و حەوت: ژیان لە پێناو غەیری خۆت و لە گەڵ غەیری خۆت(الحياة للغير ومع الغير)

مرۆڤ نابێ خۆ پەرستبێ و گۆشەگیربێ، نابێ هەر بۆخۆی بژی و تەنیا بیر لە خۆی بکاتەوە، بەڵگو ژیان ئەوکات جوانە کە لە گەڵ خەڵکانی تر بێ و لە پێناو خەڵکانی دی بێت. ئەوە تەنیا مرۆڤ نییە کە دەبێ وابژی، بەڵکو تەواوی زیندەوەران، بەڵکو تەواوی گەردوون بەو شێوەیە بەڕێوەدەچێ.

لە هەموو جیهان دەبینین بە ملیۆنان مرۆڤ لە باوکان و دایکان و براگەورەو خوشکە گەورە، وە یاخود کچان و کوران بۆ بەختەوەری کەسانی تر دەژین، لە کۆمەڵگای ئێمە بەسەدان هەزار ئافرەت هەموو گەنجایەتی و ژیانی خۆی کردوە بە قوربانی مناڵەکان، لە وڵاتێکی وەک ئەمرتکا زیاتر لە حەوت ملیۆن خێزان هەیە کە ئافرەت بە خێوی دەکا، بۆیە ژیان لە پێناو ئەوانی ترو لە گەڵ ئەوانی تر زۆر جوان و دڵگیرو خۆشە.

باوکێک چەندە ئارامە کە دەبینی مناڵەکانی خۆش دەژین، وە پیاوێک یان ژنێک چەندە کامەرانە کە دەبینێ دەتوانێ ئەویتر بەختەوەر بکات، بۆیە ئەمە دەبێ دروشمی مرۆڤی مسوڵمانی ژیر بێ کە : ژیان لە گەڵ ئەوانیترو بۆ ئەوانیتر.

## سی و هەشت: ئیسلام دینی تاک نییە بە تەنیا، بەڵکو دینە بۆ خێزان و کۆمەڵگاش( الإسلام ليس دينا للفرد فقط، بل هو دين للفرد والمجتمع)

چەند جار وتوومانە کە خێزان و کۆمەڵگا بە شێوەی دروست لە هاوسەرگیری پێکدێ، چونکە گەردوون لە سەربنچینەی هاوکاری دەژی، ئەگەر ڕۆژ نەبێ زەوی هیچ ناڕوێنێ و زەوی دەبێتە بەستەڵەک و ژیان نامێنێ، وە هەورەکان دروست نابن، ئەگەر با نەبێ هەورەکان ناگوازرێنەوەو زەوی ئاونادەن، ئەگەر باران نەبێ زیندەوەران نابن و ژیان نابێ، ئەگەر مانگ نەبێ هەڵکشان و داکشانی دەریاکان ڕووناداو ژیان بۆ گەن دەبێ، ئەگەر چیاکان نەبن ئاو بەو شێوەیە خەزن نابێ و لە دەشتاییەکان بە شێوەی کانی و سەرچاوەو ڕووبار دەرناکەوێ، بۆیە گەردوون خێزانییە، بۆیە خێزانبون یاساییەکی دینییە، وە هەم یاسایەکی سروشتییە، بۆیە لە بەر نەبوونی خێزان خەڵکانی ئەوروپا کەوتوونەتە هاوڕێیەتی ئاژەڵان بە تایبەتیش ئافرەتان کە زیاتر لە پیاوان بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتین، خەڵک کە لە ئەوروپا هاورێیەتی ئاژەڵان دەکا لە

بەر نەبوونی خێزانە، وە لە بەر کۆنەبوونەوەی خێزانییە، ئەوان لەسەر سفرەیەک دانانیشن وەک ئێمە، نەوەکان و منداڵەکانیان لە باوەش ناگرن بۆیە ناچارن سەگ و پشیلە لە باوەش بگرن، خراپتر لەوەش لە گەڵدا ڕابواردن و لەوەش ڕیسواتر هاوسەرگیری کردنە لە گەڵ ئاژەڵان. بۆیە خێزان وێڕای ئەوەی خۆشی بۆ مرۆڤ وەدیدێنێ لە زۆر ڕووەوە مرۆڤیش دەپارێزێ لە تەنیایی و نەخۆشی دەرونی و ئەو هەموو دەردو بەڵایەی کە لەو ئاژەڵانە پەیدا دەبێ.

## سی و نۆ: پاراستنی ژن و منداڵ.( مقصد حفظ المرأة والاولاد)

لەمڕۆدا بانگەشەکارانی پاراستنی ژن و منداڵ گوێی دونیایان کەڕکردوە، بەوەی کە ژیانیان و مافەکانیان و داهاتویان دەپارێزن بەڵام ساڵانە بە ملیۆنان منداڵ لە باردەبرێ وئافرەت لانەی نییە تێیدا بحاوێتەوە، کەس چارەسەریان ناکا، زیاتر لە ٨٠٠ ملیۆن مرۆڤ شەوانە بە سکی برسی سەر دەنێتەوە، ساڵانە ملیارێک و سێسەد ملیۆن تۆن خواردن بە زایا دەدرێ، ئەوە بای ئەوەیە کە هەموو هەژارەکانی ئەفریقا پێی تێردەخۆن. ئایا باوک ودایک ئامادەن منداڵەکانیان بکەنە قوربانی خۆیان؟ نەخەیر هیچ کات ئەوە ناکەن، ئایا منداڵ دەتوانێ ببینێ دایکی بە برسییێتی سەر بنێتەوە؟ بێگوومان نەخەیر، بۆیە باشترین ڕێگا بۆ پاراستنی ژن و منداڵ هاوسەرگیرییە، هاوسەران دایک و باوک و منداڵان خوشک و برایان لە ناخا یەکتریان خۆشدەوێ و چاکەی یەکتریان دەیەوێ. سەیر نییە کە لە ڕۆئاواو لە زۆر لە وەڵاتانی تر کە دوورن لە ڕێنماییەکانی ئیسلام سۆزو خۆشەویستیان بۆیەکتر نییە، چونکە منداڵ لە خێزاندا گەورەنابێ و پەروەردە نابێ، منداڵ هەیە هیچ کات دایە گەورەو بابە گەورەی نەدیوە جا چۆن بتوانێ سۆزی بۆیان هەبێ؟

## چل: هاوسەرگیری هۆكاری پێگەیشتنی ژیری و لاشەییە(الزواج سبب للتنمية العقلية والبدنية)

مرۆڤەكان لاشەو ژیری و ڕوحن، هاوسەرگیری هەرسێكیان لە مرۆڤدا گەشە پێدەكاو زیاد دەكا، گومان لەوەدا نییە هاوسەرگیری زۆر كاریگەری هەیە بۆ زیاتر بیركردنەوەو تەجروبە پەیداكردن و ئارامگری و فێربوون، وە لە لایەنی لاشەیش مرۆڤ زیاتر گەشە دەكاو بەهێزدەبێ و دادەمەزرێ، وە هاوسەران لە ڕووی دەرونیەوە هەست بە ئارامی تەواو دەكەن، ڕاستە بەرپرسیاریەتیان فراوانبووە بە لام دەروونیان گەورەبووەو فراوان بووە، هەست بە حەسانەوە دەكەن كاتێك لە ماڵێكدا كۆدەبنەوەو یەكتر دەبینن.

## چل و یەك: گەیشتن بە كەماڵ و تەواویەتی( مقصد الوصول الى الكمال)

مرۆڤ هەردەم هەوڵدەدا زیاتر پێبگاو بەرەو لوتكەی كەمال بڕوا، هاوسەرگیری دەستی مرۆڤ دەگرێ بۆ كەمال و تەواوی،مانای وانییە هەركەس هاوسەرگیری كرد تەواو دەبێ و كامڵ دەبێ بەڵام بە شێوەیەكی گشتی ئەگەر بەراوردێك بكەین لە نێوان ئەوانەی هاوسەرگیریان كردوەو ئەوانەی هاوسەرگیریان نەكردوە جیاوازیەكی زۆر دەبینی لە واقعبینی و زانستی و ژیری و تەجروبەو هیواداربوون.

## چل و دوو: خۆناسین و خەڵك ناسین( مقصد التعرف على الذات والآخرين)

مرۆڤ پێش ئەوەی هاوسەرگیری بكا لەوانەیە كەسایەتی خۆی نەزانێ سەبارەت بە میهرەبانی و وەفاو خۆڕاگری و ئاستی توانستی خۆی، بەڵام دوای هاوسەرگیری باشتر خۆی دەناسێ ، بۆیە خۆناسی بۆ هەركەس زۆر گرنگە، دوای هاوسەرگیری دەزانی دەبوو پێش هاوسەرگیری زۆر شت هەبوو بیزانیباو بیكردبا، ئێستا دەزانێ كە ئەوكات نەزانبووە سەبارەت بەو شتە، وە مرۆڤ

لەوانەیە وایزانیبێ زۆر ڕۆمانسییە لە خۆشەویستیدا بەڵام زۆربەیان بۆیان دەردەکەوێ کە وا نین،بۆیە هاوسەرگیری باشترین هۆکاری خۆناسییە، ئەوە بێجگە لەوەش کە مرۆڤ زیاتر هەوڵی فێربوون و فراژووبون و خودناسی و خەڵکناسی دەدا.

## چل و سێ: هاوسەرگیری هۆکاری تەندروستییە(الزواج وسيلة الصحة)

توێژینەوەیەکی نوێ دەریخستووە کە ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری، سوودی زۆری بۆ تەندروستی هەیە و لە کێشەکانی "سەڵت" زگورتی دوورتان دەخاتەوە و ڕێگرێکی سەرەکیش دەبێ لە تووشبوون بە نەخۆشییەکانی دڵ و بەرزبوونەوەی ڕێژەی کۆلیسترۆڵ لە خوێندا. توێژەران دەڵێن، لەمیانەی ئەو توێژینەوەیەدا نزیکەی نیو ملیۆن کەسی پێگەیشتوویان بە نموونە وەرگرتووە، لە ئەنجامدا دەرکەوتووە هاوسەران کاریگەری لەسەر یەکتر دادەنێن تا زیاتر ئاگاداری خۆیان بن و خۆیان بپارێزن، ئەوانەی بە نموونە وەرگیراون بە دەست بەرزیی پەستانی خوێن و زۆری ڕێژەی چەوری و نەخۆشیی شەکرە ناڵاندوویانە، دوای هاوسەرگیری ئاماژەکانی باشبوون لە تەواوی ئەو کێشە لە جەستە و تەندروستیان دەرکەوتووە.

د. پۆل کارتەر: سەرپەرشتیاری توێژینەوەکە لە کۆلێژی ئاستۆنی پزیشکی دەڵێ: هاوسەرگیری پێوەندییەکی تۆکمەی لەگەڵ دڵ هەیە و لە دڵەکوتێ و جەڵتەی دڵ دوورتان دەخاتەوە. ئاماژەی بەوەش دا، زۆربەی هەرە زۆری پیاوان لە تەمەنی ٥٠ و ٦٠ و ٧٠ساڵیدا تووشی بەرزبوونەوەی ڕێژەی چەوری دەبن لە خوێندا، بەڵام ئەوانەی لە تەمەنی زووەوە هاوسەرگیرییان کردووە، دەرفەتی زۆر زیاتریان لە پێشە تا لە تووشبوون بەو کێشەیە دوور بکەونەوە و زیاتر لە ژیاندا بمێننەوە.

نەخۆشخانەی زانکۆیی (ڕۆیال ستۆک) لە بەریتانیا ڕایدەگەیێنێت ئەو بەساڵاچووانەی خێزاندارن دڵیان تەندروستترە بە بەراورد بەو بەساڵاچووانەی

کە بە تەنیا دەژین و لە خێزانەکانیان جیابوونەتەوە. خۆشەویستی و تەندروستی بە چەندین هێڵی پەیوەندیی پێکەوە بەستراون. ئەوەی کە بۆ تەندروستیی مرۆڤ بەسوودە، خۆشەویستییەکی جێگیر و درێژخایەنی وەکوو هاوسەرگیرییە، چونکە پەیوەندییە کورتخایەن و پڕ هەڵچوون و داچوونەکان، زۆرکات دەبنە هۆی گوشاری دەروونی. بەپێچەوانەی پەیوەندیی جێگیر و درێژخایەن کە متمانە بەخۆبوون زیاد دەکات، ئارامی دەبەخشێ و دژی دڵەڕاوکێیە. ئەمانە چەند سوودێکی خۆشەویستیی ئارام و درێژخایەنن لەسەر تەندروستی مرۆڤ کە بە توێژینەوەی زانستی سەلمێنراون:

١- زۆر پێویستت بە پزیشک نابێ: راپۆرتی وەزارەتی تەندروستیی ئەمریکا بە پشتبەستن بەو توێژینەوانەی لەسەر خۆشەویستی و هاوژینی کراون دەڵێ ئەوانەی پەیوەندی خۆشەویستی جێگیریان هەیە، کەمتر بەهۆی نەخۆشییەوە ناچاردەبن سەردانی پزیشک بکەن.

٢- دژە خەمۆکییە: هەمان راپۆرت دەڵێ پەیوەندی خۆشەویستیی جێگیر و هاوژینی، ئەگەری خەمۆکی لەنێو پیاوان و خانماندا کەمدەکاتەوە. بەپێچەوانەی ئەمەشەوە، گۆشەگیری و تەنیایی رێخۆشکەرە بۆ تووشبوون بە خەمۆکی و ئاڵودەبوون بە مەی و مادەی هۆشبەر. هەروەها کەمتر تووشی گوشاری دەروونی دەبن، بە کەمکردنەوەی گوشاری دەروونیش (دڵەڕاوکێ و خەمۆکی) کۆئەندامی بەرگری بەهێزدەبێ و کەسەکە کەمتر تووشی پەتا جیاوازەکان دەبێ.

٣- گوشاری خوێن دادەبەزێنێ: توێژینەوەیەک دەریخستووە ئەوانەی خۆشەویستی جێگیر و پەیوەندییەکانی باشی هاوژینییان هەیە، بە تێکڕا باشترین گوشاری خوێنیان هەیە، پاش ئەوان زگورتەکان دێن و خراپترین گوشاری خوێنیش هی ئەوانەیە کە پەیوەندی ناجێگیری خۆشەویستی و هاوژینیان هەیە.

٤- دڵەڕاوکێی کەمتر: توێژەرانی زانکۆی نیویۆرک لە رێگای سکانی مێشکەوە ئەو راستییەیان بۆ دەرکەوتووە. ئەوکاتەی خانمێک دەستی لە دەستی هاوژینەکەیدایە، کەمتر تووشی ترس و دڵەڕاوکێ دەبێت بەرامبەر رووداوە چاوەڕواننەکراو و نەخوازراوەکان.

٥- دژە ئازارە: نێوەندی کۆنترۆڵکردن و پێشگیری لە نەخۆشییەکان لە ئەمریکا بە پشتبەستن بە توێژینەوەی زانستی دەڵێ، ئەوانەی پرۆسەی هاوژینی و پەیوەندی جێگیری خۆشەویستییان هەیە، کەمتر تووشی سەرئێشە و پشتئێشە دەبن.

٦- سارێژبوونەوەی خێراتر: توێژەرانی زانکۆی ئۆهایۆ لە ئەمریکا سەلماندوویانە ئەوانەی لە پەیوەندی جێگیر و هاوژینیدان و دەروونێکی ئارامیان هەیە، ئاسانتر برینەکانیان سارێژدەبن، بە پێچەوانەی ئەوانەی تووڕە و نائارام و خەمبارن.

٧- تەمەندرێژن: ئەگەری مردنی پێشوەختە لە سینگڵەکاندا بە رادەی ٥٨% زیاترە لەو کەسانەی هاوسەرگیریان کردووە. ئەوانەی گۆشەگیر و تەنیان، ئەگەری مردنیان بە هەموو هۆکارەکان زیاترە لەوانەی خێزانی هاوسۆز و کەشێکی ئارامی خێزانییان هەیە.

٨- دڵخۆشن: توێژینەوەیەکی جۆرناڵی (سایکۆلۆژیای خێزانی) دەریخستووە ئاستی خۆشەویستی نێو خێزان، لە تێکڕای داهاتی ماددیی خێزانەکە گرنگترە بۆ هەستکردن بە شادی و رەزامەندیی لە ژیان.

## چل و چوار: هاوسەرگیری هۆکارێکە بۆ وەدیهێنانی ئامانجی سیاسی(الزواج وسیلة لتحقیق المقصد السیاسی

گومان لەوەدا نییە کە هاوسەرگیری توانای سیاسی و ئیداری لە مرۆڤدا بە هێزدەکا، بۆیە هەر بەسادەی بڕوانە ئەوانەی دونیا بەڕێوە دەبەن لە رووی

زانستی، ئابوری، سیاسی، کۆمەلایەتی، پیشەسازی... زۆربەی ڕەهایان خاوەنی هاوسەرن.[٢٤]

دیارە هاوسەرگیری کە گرنگترین پرۆسەیە لە ژیاندا، وە کاریگەری لە سەر هەموو کایەکانی ژیاندا هەیە هەرچەند لەسەر ئامانجەکانی بوەستین هێشتا کەمە بەڵام ئەوەندەمان باس کرد بۆ ئەوەی خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست زیاتر بە دووو ئامانج و فەلسەفەی هاوسەرگیریدا بچێ، ئەو خاڵانە تەنیا نەخشە ڕێگابوون بۆ ئەم بابەتە گرنگە.

هاوسەرگیری کاریگەری هەیە لە ڕووی دەوڵەتداری وڵاتە هەرە پێشکەوتووەکانی دونیا پاشایەتین وەک، بریتانیا، هۆڵەندا، سوید، دانیمارک، ئەرجەنتین، ئوسترالیا...هتد. دیارە ئەم جۆرە دەوڵەتدارییە بە بێ پرۆسەی هاوسەگیری نابێ و ناکرێ هاوسەرگیری کاریگەری هەبوە بۆ ئاشتەواویی نێوان وڵاتان و پاشاکان و زانایان. پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام پرۆسەی هاوسەر گیری و خزمایەتی لە گەڵ هەرچوار خەلیفەکە ئەنجامداوە، وە لە گەڵ میسریەکان، جولەکەکان زۆربەی هۆزەکانی عەرەب کە گومانی تێدا نییە ئەم هاوسەرگیریەی سەروەرمان هەمووی چەندین ئامانجی گەورەی لە خۆگرتووە لە گرنگترین هۆکارەکان بواری پەیوەندی کۆمەڵایەتی و سیاسی بووە.

## چل و پێنج: ئاشتەوایی کۆمەڵایەتی( تحقيق الأمن الاجتماعى)

گومان لەوەدا نییە کە هاوسەرگیری باشترین هۆکاری ئاشتەوای کۆمەڵایەتییە لە کۆمەڵگادا، وە چەندین جار ئاژاوەی گەورە لە ڕێی هاوسەگیرییەوە کۆتایی پێهاتوە، کەسەکان خزمی پشتیان لێ یان

---

[٢٤] ڕووداو – هەولێر، ٢٠١٨ /٢/٢٣

دووردەکەونەوە بەڵام خزمانی هاوسەر نزیک دەبنەوە، هەر خۆی هاوسەرگیری دامرکانەوەی ڕق و کینەیە لە نێوان تاکەکاندا، زۆر جار کەسێک تۆڵە ناسێنێتەوە بۆ ئەوەی ئاژاوە بۆ ماڵ و خێزانی دروست نەبێ، یان بە پەلە فریای ئەو کێشانە دەکەوێ و حەلیان دەکا کە لە ڕێی هاوسەرو مناڵەکانییەوە بۆی دروستبوون، ئەمەش مانای ئەوەیە کە هاوسەرگیری دەوری کارای هەیە لە سەقامگیری ئاشتەوایی کۆمەڵایەتی و خێزانی.

# کۆتایی

## خوینەری سەنگین!

وەکو ئەوەی باسمانکرد گومان لەوەدا نییە کە هاوسەرگیری و خێزان پرۆسەیەکی گەورەو گرنگە، بەڵکو گرنگترین پرۆسەیە، هەربۆیە ئیسلام زۆر گرنگی بەو بوارە داوەو ڕێوو شوێنی توندوتۆڵی بۆ گرتۆتە بەر، کە ئەگەر لە سەری بنوسرێ بە دەیان و سەدان کتێب تەواو نابێ، بەڵام ئێمە هەوڵمانداوە لە میانەی زنجیرەیەک کتێب تۆزێک باس لەو بابەتە گرنگە بکەین کە بەرگی یەکەم لەم کتێبە تەرخان کراوە بۆ دوو بابەتی سەرەکی:

یەکەم: مانای خێزان و تایبەتمەندیەکانی خێزان و ئەرک و سیمای خێزانی مسوڵمان

دووەم : باس لە ئامانجەکانی هاوسەرگیری دەکا لە میانەی ٤٥ ئامانجدا، بۆ ئەوەی ئەوەی بە تەواوی بەرچاوڕوونیمان هەبێ سەبارەت بەم پرۆسە گەورەو گرنگە.

سوپاس بۆ خوای گەورە کە دەرفەتی ئەوەی پێدام کە بەرگی یەکەم تەواو بکەم، هەر داوا لەو دەکەم کە یارمەتیمم ئەم پرۆسە گرنگە بە پایان بگەیەنم.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

حەسەن عەلی بۆسکێنی

## سەرچاوەکان

لە دوای قورئانی پیرۆز:


١. صحيح البخاري.
٢. صحيح مسلم.
٣. سنن الترمذي.
٤. سنن ابي داود.
٥. سنن ابن ماجه.
٦. مسند أحمد.
٧. السلسلة الصحيحة/ المحدث محمد ناصر الدين الالبانى.
٨. صحيح الترغيب والترهيب/ محمد ناصر الدين الالباني.
٩. تلخيص الذهب متن لسان العرب/ محمد حسين الحسيني الجلالي.
١٠. كتاب التعريفات / علي محمد بن علي الجرجاني.
١١. المصباح المنير/أحمد بن محمد بن علي المقرئ الفيومي.
١٢. المعجم الوسيط/ لجنة من العلماء.
١٣. القاموس عربي عربي/ اعداد محمد هادي اللحام، محمد سعيد ، زهير علوان.
١٤. اصول الدعوة/ عبد الكريم زيدان.
١٥. ملامح المجتمع الذي ننشده/ د.يوسف القرضاوي.
١٦. قواعد تكوين البيت المسلم/ د. اكرم رضا.
١٧. صور من حياة المرأة في الغرب/ د. مازن مطبقاني.
١٨. حال المرأة قبل الاسلام وبعده/ وليد بن خالد العامري.
١٩. المرأة في ظل الاسلام/ د بدر عبد الحميد هميسة.
٢٠. المرأة بين الشريعة والقانون، مصطفى السباعي.
٢١. المرأة فى أ سفار التوراة/ على عبد الله الجباوى.

٢٢. الكتاب المقدس الدراسى.
٢٣. المرأة فى الفكر الاسلامى د. جمال محمد فقى رسول باجلان.
٢٤. موسوعة الاسرة ، مراحل تكوين الاسرة تحت رعاية الاسلام / عطية صقر.
٢٥. نظرة في علم الاجتماع المعاصر/عبد الحميد خطيب.
٢٦. موسوعة التفسير الموضوعى للقرآن الكريم/مركز تفسير للدراسات القرآنية/ ج ٣.
٢٧. ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا/ مامۆستا علی باپیر.
٢٨. مكتبة الاسرة المسلمة /خالد عبد الرحمن العك.
٢٩. موسوعة الزواج الاسلامى السعيد/ محمود المصرى.
٣٠. شخصية المرأة المسلمة كما يصوغها الاسلام فى الكتاب والسنة/ الدكتور محمد على الهاشمى.
٣١. قواعد الاحكام في اصلاح الانام / عز بن عبد السلام.
٣٢. حقوق الانسان فى الحرب والسلم بين الشريعة الاسلامية والقانون الدولى العام/ الدكتور على بن عبد الرحمن الطيار.
٣٣. الانكحة الفاسدة انواع الزواج قبل وبعد الاسلام/ ناصر عبد الرزاق
٣٤. الانكحة الفاسدة دراسة فقهية مقارنة/ عبد الرحمن بن عبد الرحمن الاهدل.
٣٥. الانكحة الفاسدة المنهية في الشريعة/ امير عبد العزيز.
٣٦. السيرة النبوية/ ابن هشام.
٣٧. نظرة في علم الاجتماع المعاصر/عبد الحميد خطيب.
٣٨. رووداو – هەولێر، ٢٠١٨/٢/٢٣.

## جۆ باسەكان